پێشکەش بە:

دایکم

کە تا ئێستا مەرگی لە

گەڵ خۆی بەکێش کردوە

«شێعری شێت»، ناوی ئەم ئەزموونەیە کە وەکوو ڕووداوێکی تایبەت، لەم‌ساڵانەی دواییدا، هەڵس و کەوتێکی زمانی جیای لە پانتای شێعری‌کوردییا، بۆ خۆی دەستەبەر کردووە. دیارە لەمپەرێکی جیدیش بۆ دووانو باسی هەمە لایەنە، سەبارەت بەم ئەزموونە، مەستووری و بەردەستنەبوونیان بوو.

ئەم دەفتەرەی ئێستا لە بەر دەستمان دایە ـ هەڵبەت ـ جیا لەم شێوەشێعرەی گۆڕین، داگری چەشنەکانی‌تری کاری زمانیشە کە بەوپێناسەیەی خودی شاعیر بۆ شێعری شێت پێی قایلە، ناکرێ بخرێنەخانەی ئەم ئەزموونەوە.

لە راستیدا ئەگەر بمانەوێ هێڵێک بکێشینەوە کە نیشاندەری ئاڵ و گۆڕی‌کردەکانی زمانیی شاعیر، لە سەرەتاوە تا ئێستا بێ، دەتوانین بڵێین ئەم‌هێڵە لە دوو نوختە گۆڕاندا دەچەمێتەوە و دەبێ بە سێ بەش. بەشی‌یەکەم ئەم ئاڕاستەیە دەگرێتە خۆ کە لە قەسیدەی مێژووی شێتی و تارادەییێکیش لە سێ شێعری درێژی دوای ئەودا، خۆیا دەبێ.

بەشی دووهەمی ئەم هێڵە، لە دەسپێکی شێعرە کورتەکانەوە ـ وانە نوختەگۆڕانی یەکەم ـ هەتا ئەو هەوارەی «شێعری شێت» دەواری لێ هەڵدەدا وبارگەی لێدەخا، دەخوشێ و دەچێتە پێش. شێعرەکانی نێوەراست وکۆتایی ئەم دەفتەرە ـ بە پێی روانینێک ـ نموونەی تەواو عەیاری شێعری‌شێت ـ ن و دەکرێ وەکوو پێش نموونەی (Prototype) ئەم ئەزموونەچاویان لێ بکرێ و بخوێندرێتەوە.

ئەم کۆمەڵە شێعرە ـ بەڵام ـ نوختە گۆڕانی دووهەم و بەشی سێهەمی‌ئەزموونە شێعرییەکانی خاوەنی ئەم دەفتەرە، ناگرێتە خۆ و درێژەی ئەم‌دیالۆگە شێعرییە، هەڵدەگرێ بۆ دەرفەتێکی‌تر و دیمانەیێکی‌شاعیرانەی‌تر .

لە بارەی تایبەتمەندی ئەم بەشەی سێهەمدا ـ کە رەنگە هێشتا بە تـەواوی‌لـە کـلّی گووران و رسکانیش نـە هاتبێتـە دەر ـ دەتـوانم بـلّێم ئاوقـا بوونێـکلـەو دوو سروشتە شێعرییەی پێشووی تێدا بە دی دەکرێ.

سەرەتایی‌ترین و بەرچاوترین رەفتاری زمانیی شێعری شێت، تراز ان لەپێکهاتەی خەتی شێعر و خەریک بوون بە رەفتارێکی نا ـ خەتی وشێوەبازنەیـی، بـە هـۆی بردنە سەری رێژەی چەند پاتەیـی(Frequency) یـەکـەکـانی پێـکهێنـەری شێعرە.

با ئەوەی پێشەکییەکی کورت، ناتوانێ پەنجەی بۆراکێـشی، کـۆی‌شـێعرەکـان ـ خۆیان ـ بە گوێی خوێنەری شێعرناسی‌دا، بچرپێنن.

**رەهبەر مەحموودزادە**

مێژووی شێتی

پێش وتار :

داد لە زۆربڵەیی باران

پەنا لە دەم هەراشی دڵی خۆم

ئەوین وێردی گشت چرکەکانی تەمەنیانە و

ئەوین ـ بەڵایە، بەڵا...

دەتۆ بڵێ: ئەی خەفەتی رازاوە

پەناهەندەی کام وشە بم؟

وشە ـ ئەو گومان لێکراوەی وەک نێزەک

بە گریانما رادەبووری.

گڕ گڕ گڕ گڕ

:دۆزەخ، ئەی دایکە دلۆیانەکەم!

شین شین شین شین

:دەریا، ئەی تۆ سنووری مابەینی من و

خنکان!

کامتان بینم پێوە دەنێن

(با هەموو مەراقەکانتان پاراو بن).

من کە دەڵێم:

زەمان لوورە لوور زراوم دەبا

[تۆ ئیتر ئەفسانەکانم بە روودا مەپشکوێنە]

من کە دەڵێم: جەغزی بێدەنگیت مەنزڵگای تەنیاییمە

ئەو شێعرە ناوەختانە وەلا نێ

[تاوانی دڵمە ئاژاوە ناخوانەوە].

دۆزەخ! ئەی دایکە میهرەبانەکەم

(هەڵبەت تکایە هەرگیز من مەدرکێنە بۆ فێنکایی)

ئەو سووتانە بەردەوامە نەبێ، پیر دەبین

پیر.

ئێمە رۆڵە حەرامزادەکانی سیاسەتی عەشقێکی دیکتاتۆری نین

بەڵام

گلێنەی هەناسەمان کێڵگەی گومانە

لەپی بینایمان توهمەتی لێ رواوە

درۆمان وەک شەماڵ ویرەی دێ و

هاوڕێی ئاو ناکەین

هاودەردی با ناکەین

(بۆلێک دانەوەی زیاتر ئەمەش هەواڵێکی نوێ)

]با ـ وەک دەروێشەکانمان کاتاتۆنی گرتووە

چاو ئەکا بە پەڵە شمشێردا

بە سەر زەمزەمەی دۆزخا کۆچ دەکا.

بەشی یەکەم:

نان لە بیر چوونەوەی لە قامووسدا نیە

ئێمە نانمان سیاسەت بوو و

برایەتی

سەردەمی حکوومەتی برسیەتی

وڵاتی برسیە فیدڕاڵەکان.

بەشی دووهەم:

غەریبی من و نامۆیی تۆ، دەستە خوشک بوون

تەنیایی من و شێواوی تۆ؛ شۆڕشگێری بێدەنگیەکی مەرگاوی بوون

چاوی من و هەناسەی تۆ؛ تەژین لە باس و خواسی نهێنیەکانی دەریا.

ڕووداوەکان:

من و تۆ وەک دوو قوتبی دژ بە یەک

تۆ لە سەهۆڵبەندانی سڵاوەکانی قوتبی باشووردا

من لە زەمهەریری هەواڵەکانی قوتبی باکووردا

هەتاو پۆستچی نێوانمان بوو.

کە دەگەییە لام شەش مانگ هەواڵتم لێدەپرسی

**(ئاوێتەی ئاوا بوون و سپێدە)**

کە دەگەییە لات شەش مانگ تاریکت دادەگێڕا

**(ئاوابوونی بێ چارەنووس)**

ڕووداوە فەرهەنگی و هونەرییەکان:

١) لە کۆڵانی هەر وشەیەکمدا ـ ڕێژنەی ئەوینە

لە ئەسرینی هەر سانمدا ـ بزەی دەریایە

لە کۆتایی هەر ڕۆژمدا ـ چیرۆکی بێبڕانەوەی هەتاوە بەر لە سەرەمەرگ

٢) وەرزەکانم دەکردە ملوانکە ـ گەر تۆ وتبات شێعریش

کۆچەکانم دەکرد سەر هەڵدان لە گەڵ ـ با ـ گەر وتبات لە گەڵ باخیش

شێعرەکان دەکەمە بێشەیەک پێکەنینی سەرشێت ـ گەر تۆ بڵێیترا ویلکەش

جوگرافیای تەنیایی:

من سەردەمێک لاوەتیم شناوە

بلووغم وێڵی هەناسەی داروبەرد بوو

پیریم کۆخەکۆخ تێکەڵی خەونی گەنم و بیرەوەرییە نەنووسراوەکانی گریان بوو

ئێستاش تەنیاییم ـ بە سمێڵی بابڕیەوە

ئێوارەم ـ لە هەڕەتی لاوەتی‌دا

دڵتەنگیم ـ لە دەمەدەمی هەڵچووندا

دەست و موشتاغم لە گەڵ دەکەن و

من نارِوێم و ـ بێدەستەڵات.

تێبینی:

(کە باران دەستیکرد بە گێڕانەوەی

چۆم و کانیاوە مردووەکان

کێ دەستەڵاتی رووانی بێ

دەبێ بڕوێ).

هەر دەڕوا کاسێتی تەنیاییم؛ پڕ لە نەعرەتەی وەنەوشە

منیش بە دەم بەرەژانی شێعرەوە: (سەفەرخۆش)

تۆ بە سەر یاڵی عەشقەوە: (بای بای)

من لە ئامێزی شەپۆلدا: ]هەی خودا لەم ئاگربارانە[

تۆ لە گەڵ هەنسکی پەپوولە و ماندوویی شێعردا: ]پرچی سپی خەونەکانت

نا ـ ئەمە ـ نا

تەنیایی خۆت دەهۆنیەوە[

وتەکانی ڕەسووڵی سەردەمی شێتی:

ـ من خەونی خودا لە هەرەتی شێتی‌دا دەگێڕمەوە

(هیچ ئەبووجەهلێک ناتوانێ

شان نەدانە ژێر باری وشەی ڕەسەنم)

ـ من باسی ریسالەتی مەم دەکەم

(هیچ زینێ ناتوانێ ئیمان بە خەوم نەهێنێ)

ـ من لە بیعسەتی گوڵ دەدوێم

(هیچ هەورێ ناتوانێ سوورەی گۆرانی تەڕم بۆ نەخوێنێ)

من لە پێغەمبەرە حەرامزادەکانی سیاسی نیم

لە تیرەی خوا نەگبەتیەکانی تەوەزەلی نیم

ئەمانە رای ئیبلیسە، راوێژ خۆشەکانی سالّی بێبزە و شیعرن.

لێکدانەوەی هۆنراوەیەکی سیاسی، بە وەزنێکی سیاسیەوە

(ئەوین دەژاکێنێ و

من ئەویندارم ئەویندار).

هەڵمژینی هەوای سیاسی، بە سیبەی سیاسیەوە

(خنکان میوەی نۆبەرێتی و

من دەمێکە خنکاوم، خنکاو).

مردنی سیاسی، تابووتی سیاسی، سەرەخۆشی سیاسی(١)

(هیچ مەرهەمێ سارێژیان ناکاو

چ زامێکی لێڵم من ـ بە تەوێڵی

ساڵەوە).

پەندی پێشینیانی شێت:

پشتاو پشتم باخەوان

لە پاییزی بێگوڵ و لە ویشکە ساڵی شکۆفەدا

باخمان بەری نەهێناو پیر بووین

ئاخمان لق و پۆپی دەرکرد

١ـ تەمی شێعرێکی شیمبۆرسکای بە سەرەوەیە.

میوە ژان و

گەڵا حەسرەت

**باخەوان باخت لە کوێیە؟!**

کەس و کارمان بەردەوام رێبوار

بە کوێرەرێی مەرگ و شێعر و هەژاریدا.

ئەم رێیە هەناسەی سێحراوی فریشتە

چەوساوەکانە و

بێکۆتایە

ئەم رێیە هەر بچووک دەبێتەوە و بچووکتر

هەنگاوەکان شەهید دەکا

هۆ خاڵۆی رێبوار ئەتۆش رێگا نازانی؟!

فەلسەفەی سەردەم و پەراوێزەکانی:

چی بنووسم؟

من جیاوازی نامەی دڵداری و قسەی فەلسەفی و سیاسی نازانم

فەلسەفەی سیاسەتی ئەوین

(سەرشێت بوونی مرۆیێ لە گەڵ زەمان)

ـ ئەمە رای ئەو فیلسووفانەیە هەرگیز لە

دایک نابن ـ

چی بنووسم ؟

لە زەمانی دەستەڵاتداری ئەهریمەنی دووریدا

مرۆیێکان هەموو یاخی لە یاسای ئاسایی زەمین

پێکەنین کودتا دەکا و

رژێمی ئەم سێبەرە لێک هەڵدەوەشێ

(سیاسەت ئاوا باڵی بە باڵی ئەوین دەگرێ)

ـ ئەمە رای ماکیاویللیەکی گەمژەیە ـ

کەویستم دەست و موشتاغی هەور بکەم

]وشکە ساڵ لە ئەندێشەما دەواری هەڵدا[

که نمەنمە باسی بەهارم بۆ کانیاوەکان دەدرکاند

]خەزەڵوەر بەیاننامەی نەخۆشی بۆ نیشتمانم نارد[

خۆم بەرەو ئەوینی کیژێکی چاو ئاسمانی، دەستە خوشکی شەپۆل و باتوورِ هەڵدا

]ئیبلیسێک بە سۆزی لوورەوە

بە لەنجەی وێرانەوە

لە ئامێزما پشکووت[.

من لە دەست هێمنایەتی نوێی دونیا و سیاسەت رادەکەم

وەک ئەو وشەیەی

هیچ شێعرێ ئیزنی پەناهەندەیی پێ نادا

وەک ئەو بایەی

هیچ سنوورێ پاسپۆرتی تێپەڕینی ناداتێ

ـ هەر چەند با سنووریش نەناسێ ـ

من سنوورم خۆش دەوێ

ئەو سانەی بەرەو ئەبەدییەت درێژ بێتەوە **(نەک بمخاتە گێژەنەوە)**

من بارانم خۆش دەوێ

ئەو دەمەی هەژاریم پاراو کا **(نەک بەرەو خنکانم ببات)**

من بە نێو کووچە باخی سێحردا دەڕۆم

ئەو کانەی شێعر دێ و دەم دەخاتە گێژەنی ژینمەوە **(نەک سێداره هەڵدابۆ هەستم).**

دایکم سەرەتای خۆشەویستی بوو ـ نەک کۆتایی

**(کۆتایی ئەوینی من مەرگە)**

باوکم درێژەی چەوسانەوە بوو ـ نەک سەرەتا

**(سەرەتای چەوسانەوەی من بەر لە مێژووی پێکەنینە)**

هەواڵانم سەرەتا و کۆتایی تەونی ژیانمن ـ نەک هەر کەرتێ

**(شێت بم ژیرم دەکەنەوە**

**شێت بن لە گەڵیان شێت دەبم)**

ئەوەیە ژیاننامەی من و مێژووی هەناسەکانم

خۆمێکی وێڵ

ژانێکی وێڵ

خەمێکی وێڵ

لە زەمانێکی وێڵی سەر شێتدا.

سەرەتای بەشی یەکەمی شێتی

یەک... دوو... سێ

[**درێژەی ژوماردنی حەبسانەکانی زەمان**]

من... تۆ... ئێمە [**دووپاتەی شیرینی نەسرەوتن**]

ترس... پێداویستی... هیرۆی ئارەزوو

]زایەڵەی شێتی فەلسەفە لە چوارچێوەی بێسنووردا[

مەملەکەتێکی وشەیی

بەندیخانەیەکی خەون و

حکوومەتێکی شێتوکراێ

بە خوێنی گومانی، نەسرەوتن مۆر کراوە: سەنەدی وێڵیمان

ـ ئەو هەستنە شیرینە شێعرە

بە دەستی تاراوگەی بێنیشان ئیمزا کراوە: پێناسەی هەستیمان

ـ ئەو وشەیە دڕدۆنگی مرۆیە

بەرەو رەها بوون

بۆ دوورگەکانی بێ زەمان و بێ مەکان ـ

بەرەو قووڵاییم.

پەیامی شێتەکانی ئەو هەرێمە بۆ زیگمۆند فرۆید و ژان پیاژە

وەک کانی بەردەوام سڵاومان

(باسی وەرەزی شەپۆل لە دەریا ناکەین؛ وتەی دڵمانە ئەیوەرین)

چەشنی با لە گەرِدا ئەندێشەی شێد ارمان

(سەر گوزەشتەی ئەفسانەیی ناڵێینەوە؛ رووداوی ئێستایە ئەیبیستن)

بە چەند پشت دەگەینە شەوکەران

بە چەند ماچ دەبینە دەزگیرانی مەرگ

(قسەی لە بیر چوونەوەی پێکەنین نیە؛ کارەساتە کە ئەیبینن)

خەوی دەسکردیش نامان گەیەنێتە راستی

ئاوارەیی مێژووشمان هەواڵی ئازادی پێنیە

(گرنگ رووخانی پەرستگەی تەنیایی نیە

کرنۆشێکی بە کۆمەڵە ئەیخۆێننەوە)

شنەی شێتیمان میوانە

سەما، سەمای خەزەڵوەری پەپوولەیە و

وەرینی گەڵای ئەسرینە لە داری پەژارە

باوکمان، گومان لێکراوی بێ دەوڵەت

لـــە

خوێنی ترسدا گەوزاو.

لە نائاگاییماندا شێتی سروشتە و سەرشێتی ئەوین

لە داهاتوومانداا زینای ویژدانە و کوشتنی هەوەس

شەرمەزاری ئەندێشەین و

منەتباری ئازادی.

لێرە: هەر کەمینە بۆ لە داوخستنی مەرگ و

PDF 4 KURD

لە خاچ دانی بە بەر چاوی خۆفمانەوە.

شێتیمان لێڵی لێڵ

خولیامان وێڵی وێڵ.

هەر ئامێزی (پەڕانتێزی) جەبرە

دەمانگرێتە بەستێنی و

بەر لە شکانی تینوێتی ئارەزومان

ـ مەستمان دەکا ـ

ئیتر سپاس ـ بۆ ئێوە و هەرچی شێزوفیڕنیایە ـ

چەند پەراوێز

ئاوێنە لە خۆبایی بوون

ـ بریا راستەقینە خەونێکی بە ژان با ـ

پاینجە چڕ و پڕی لووتکەیان لێک دەداوە

ـ خۆزگە سەرکەوتن لە عەقڵ مەزنتر با ـ

شوورە لەمپەری یەکیەتی رووبار و خەوێکی ئاسمانییە

ـ بریا هەناسەکانمان لێکیان دوور نەخستبایینەوە ـ

(کوتەی دڵمان لە گرەوی شێتیمان دایە).

ژیان

لە بەخشینێکی ئەبەدی دایە ـ ئاوایە سەفەرنامەی خۆر

ئەوین

لە لێڵییەکی بەردەوام دایە ـ ئەوەیە بەربەرەکانی مانگ دژی تەم

سەما، سەمای هەواڵ هێنەرانی ئاوێنەیە

چ بارێکی پیرۆز و پاکە ئاوێنە

سەماکەر **١٢٤** هەزار پەرەسێلکەی مەست و

سەرشێت.

من مەلۆتکەی برینم و سواڵی ئەوینی مرۆیٚ دەکەم

دەمەدەمی ئاوا بوونە

(سواڵ مەترسی بیٚ ئابڕوویی بە دواوەیە)

من ئەوین لە گەڵ مەرگ دیٚنمە وت و ویٚژ

ـ سەرەتای بەسەرهاتی هەتاوە ـ

(ئەم پەیٚیینە تارای ئەبەدییەت بەسەر زامدا ئەدا)

لایەنگری رەسووڵی سەدەی بیست و یەکەمم

ریسالەتی هەر شیٚتی و سەرهەڵدانە و... هیچ...

شڵەژاویمان رەوانە ـ بیٚشە پیٚمان پیٚدەکەنیٚ

سامان بیٚ بنە ـ قووڵایی میٚژوو چاوی لیٚمانە

شێتیمان رام ـ ئەسپێکی دەستەمۆ لـە سـەر پاشـوو
دەحیلێنێ.

یەک... دوو... سێ... ژوماردنی قاسپە قاسپی گوللەیە و

گارە گاری مەرگ

لە رۆژئاوایەکی شێتدا.

خواردنەوەی غەریبی لە چاوی تاراوگەوە

هەڵدانی پێکی زامە کۆنەکانی گۆرانیە

نم... نم... نم...

سێ کۆتر لە هەڵفڕینێکی تا... هەتاییدا

بەسەرهاتی گوڵاڵە بۆ دڵیان دەگێڕنەوە.

سێ گەڵا لە سەفەرێکی ئەرخەوانی دان

لە دەوڵەتی دارێکەوە

بەرەو جیهانی خەزەڵوەر

سێ ئەسرین وەریون... وەریو

میوەکان لە حەسرەتی شەماڵدان

مەمکی تورتی پێکەنینیش کراسی گریانی نەدڕی.

کیژۆڵەکان: **(دەڵێن لە تیرەی هەناسەی پەریەکانن)**

سەمای بلووغیان لە بیر چۆتەوە

ـ ئای... کیژۆڵە ـ

لاوەکان: **(لە بەرەی چەوسانەوەن)**

سۆکە سۆکی بزەیان لێ ون بووە

ـ ئۆی... لاوەکان ـ

ئیتر هەتاوی پەتیارەی ئێمە لە
رۆژئاواوە هەڵنایە

ئەم بڕوایە

دوای بەسەر چوونی زیندە
خەوی سەر بەخۆیی ماچ

پەسەند کرا

کۆنترین و نوێترین مێژووم... شێتییە

(مێژوونوس هەڵوەدای رووداوی هزری

پاساریيه)

سەوزترین و زەردترین پەیامم... هەڵچوونە

(رەنگ رابردووی داگیر کردووم و لە

ژووانی ئێستاشم دایە)

دوورترین و نزیکترین هیوام .. بارانە

(باران! ببارە رێزە بەرێزە).

پردێک لێدەدەم بە بزەو تێک دەرۆخێ بە هەنیسکێ

ـ ئیمانم پتەو با هەنیسک دەژاکا ـ

رووبارێ بە خولیاما دەخوشێ و قاقرێ بە دەمارەکانما

ـ (بەهارم میوان با رووبار زێتر ئەژیا)

شۆڕشی وشه سەر دەکەوێ و نەزانین لەمپەرە

ـ گەر شێعر چەکدار با سەربەخۆیی دەبووە میوانی ئێستامان ـ

کزە با ویرەویر بە مەملەکەتی گۆرانی دانێدەپەڕێ

]قوربانت بم ئەی بای وادە[

هەور نهێنی ئاسمانی لە دڵ دایەو نایدرکێنێ

]هێندی ئەو هەورە خەم لە دڵم بارە[

خوا لە نیشتمانی سەربەخۆیی خۆیدا حکوومەت دەکا

و ئێمە لە کۆڵانی ئەوینی خۆماندا

]ئای نیزام خۆمان نیزام[

وتوویژێکی تەلەفۆنی شێتانە

کالێ: من ئەوە لە پایتەختی مەرگم

له چاوی ئەهریمەنەوە دەدەوێم

ـ سڵاو.

سوارۆ: من له ماڵەوە.

له نێو زەنا زەنای ماچی پەریەکانەوە وڵامت

دەدەمەوە

ـ سڵاو بۆتۆ.

هۆ خانمۆڵە!

هۆ گەورەی کیشوەری خەمباریم

ئەو سڵاوە پەشۆکاوەم نەتژاکێنێ

ـ چۆنی ؟

سوارۆ!: دەمویست هەواڵت بپرسم

ئەسپێکی ماندوو بوو وشەم

ئەو ریسالەتەی هەڵنەگرت.

چاو کاڵ گوێت لێمە؟

درۆ ـ ئەو پێکەنینەیە دەڵێن باوکم لە خەودا دیویە

ـ من ڕاست دەکەم ـ

بەستێنەکان خۆشەویستن و ـ ئامێزی تۆش

بەهار دڵگرە و ـ باسی هەناسەکانت ناکەم

(زەمان لە مابەینی لێک نانی دوو پیلووی چاوتا

لــــە

دایک دەبێت و دەمرێ)(١)

تۆ زەمانی...

کاڵێ گوێت لێمە؟

نامەکەی بەندیخانەم گەیشتە دەستت ـ نامە لێڵەکەم ـ

من و تۆ و (ئێمە)

لە مێژووی سیفرەوە تا ئێستا ٧٧/١١/٢ ی هەتاوی بەند کراوین

لەوانە گەڕێین

١ـ تەمی شێعرێکی رەفیق سابیری بە سەرەوەیە.

من تۆم خۆش دەوێ...

کاڵێ:

دایکم هەم نیشتمانمە و هەم هەستی

هەم سەرەتامە و هەم کۆتایی

چ زەمانێکی لیخنە ـ کاتێ دایکمان لە بیر باڵندە دەچنەوە.

بۆ تۆ دەدەوێم:

ماندوو لە سەفەری مێژوویەکی لە مێژینە گەڕاومەوە

رێبواری رێگای داهاتوویەکی دوورم

زوبانی گوناهDEL فێر بووم

گۆرانی بەند و

ئایەتی درۆ.

... گوێت لێم بێ: ئەو هەمووە پرسیارە بۆ وا کەسیرەن ـ بۆ؟

ئەو گشتە هەنگاوە کەی لە

هەڵبڕین دەبنەوە ـ کەی؟

ئەو هەمووە خۆشەویستی‌یە چۆن

کۆتایی دێ ـ چۆن!

ئەی دەستە خوشکی تریە تریی دڵم

ئەی دەریا

من ئەوە لە دوورگەی نەگبەتی دام و

تینوێتی دەچڕم

شەپۆلی ماچەکانت پەرەو ازەی ئێرەکە

ـ ئیتر ماڵئاوا ـ خانمۆڵە ـ ماڵئاوا.

بەشی دووهەم

گێڕانەوەی خەونەکانی ئەویندارێک

وەک چەمەری قاقایەکی سووتاو بۆ تەمێکی رەویو

چەشنی لێک پچڕانی پێوەندی تەمەن و بزە

بەر لە نەگبەتی باڵندە و بێ دالدەیی با

لووره لووری تـەنیـاییم بـوو لـە

بون بەستەکانیهەتیوی‌دا.

هەو هەوی شەماڵ بو و لـە سـەر

زینی دەربەدەری و

شنەشنی من بـوو لـە پێـدەشـتی

کەساسی‌دا.

شەپۆلی جەستەم خۆ بە بەستێنی زام دا ئەدا و

بەشان و ملی مردنا دەچۆڕێمە خوارەوە.

زام پرسەم بۆ دائەنێ

ـ بۆ خۆتـان سـڵامەت

بن و مێژووتان

ئەوینی بە بڵێسەی بـۆ

ئێوە بە جێ هێشتبێ ـ

مەرگ خوازبێنی هەناسەکانم دەکا

لە دەرفەتە تەم گرتۆکانی تەنیاییم

مارەیی ئەو کۆچەم شێعرێکە و

گیازیشم ـ تابووت و کەل و پەلی پێویـستی مـن و
فریشتەکان...

تەم ـ دەتەنێتەوە بە لووتکەی لاوەتیمدا

**ـ چ پیرانە تێکەڵ باران بووم ـ**

خەم ـ بە سەر جەغزی گوڵاڵەیی بزەمدا پیاسە دەکا

**ـ ئای لە هاودەمی منالی، بەرۆکی بیرەوەریم بەرنادا**
**ـ**

سەما دەکەن ساتە بێوەژنەکانی گریانم

لە سەر نەخشەی بێ سنووری ریسوایی.

لە پاشای مەنزومەی چاوەکانمدا.

پوورەی مەشـغەڵـە لـە کـاکی بـە کـاکی
کاسەی سەرما

زرمە زرمە زرمی هـەرەس هێنانمـە بـەرووی
پشکووتندا

شێتە شێتە شێتی رووحمە لە چاوی هیوادا.

نەسڵاوێکم سەری خۆی هەڵگرت و

نە ماڵئاوایی بە پڕمە پڕمە پڕمی شەکەتیەوە

بەرۆکی بەردام.

بمبوورن ـ وڕێنەکانی خـودایی و سـەرەتاکـانی ئێمـە بـەرەو

بوون ـ

بمبوورن.

هەتاو هەڵدەپروکێ بەسەر رابردووی ون بوومدا

ـ بەربەیانە.

ژین تریفە ئەدانەوە لە سیمای نوێ بوونەوەمدا

ـ کازیوەیە.

شێعر بانگەوازێکی ناوادەی سەر هەڵداوە لە سبەم دا و

فریای پێشوازی ناکەوم.

حەوتوویەکی شێت

شەممۆ ـ ناونیشانی ئەوین لە خوێنمدا دەنووسمەوە

(شـێتی کـەم زەیـنی کـردووم و

گێژ)

یەکشەممۆ ـ پیرە ئەویندارەکەی دایکم و لەیلا و بارانم

(هێندێ کەس لە بیر چوونەوەیان ـ بۆنیە ـ

نی)

دووشەممۆ ـ نارنجاری دووری لە چاوی نێرگزەکاندا شەپۆل دەداتەوە

(کەوتمە کڵێ سووتانەوە ـ چـۆن

نەسووتێم)

سێشەممۆ ـ (سووتان)

بوونە تەمەنی بڵێسە و چوارشەممۆ

فاتیحایەک

لە گەڵ خوێنـدنی کـەڵـەشـێری

بەیانی ـ پێنجشەممۆدا

ئەمڕۆ ـ هەینی

زەمان هەپروون هەپروون بووە

تێپەڕین، بواری نیە و کەڕ و لاڵ

راوەستان ـ سۆمای چاوی نیە و کوێری کوێر.

ئیتر لە بەندی رۆژەکان دەرباز بووم و

حەوتووەکان بوونە تاراوگەی رابردووم.

رابردوو شەهیدە ـ شەهید.

دالآنی سەرەتایەکی نامۆ ـ ونم دەکا

له تونێلی دوایین کۆخه کۆخه کۆخه‌کانی نه‌دامه‌تی‌دا

ده‌مبێنێته‌وه ـ زه‌مان.

چ بێعاره ئه‌و ده‌هۆڵه سیحراوییه‌ی سینه‌م.

به‌ربه‌یانه و هه‌تاو هه‌ڵده‌پرووکێ به سه‌ر ته‌مه‌نما

کازیوه‌یه و ده‌دروشێمه‌وه به تاقی بڵێسه‌کانی ئه‌وینه‌وه.

به‌یانیت باش!

ـ که‌سه‌که‌م! بێده‌نگیت حکوومه‌ت ده‌کا، له نیشتمانی غه‌ریبم‌دا

ـ باوانه‌که‌م! دووریت تکه تکه تک، داوێنی کسپه‌کانم گڕده‌دا.

ـ له‌یله‌که‌م! ده‌واز بێنه، له لایه‌نگری دیکتاتۆری راز و نه‌درکان.

شه‌هیدم، به ده‌ستی خوا له رێی ئه‌ویندا

ئەی ئێوە ـ ئێوە ویژدانە نامۆکان

ئازادم کەن ـ ئازاد.

یەخسیرم، بە سەری ئەهریمەنی دووریت

ئەی تۆ ـ تۆ یەزدانە شێت و وێنەکەم

شەتەکم دە ـ بە دوورترین و نزیکترین سووتانەوە.

هەر کەس رۆژی زەماوەندی بیرەوەرییەکان

کسپەیەک نەکاتە شاباش

کوا شاعیرانە ژیاوە؟

لــە کــوێ عارفانــە

مردووە؟

ئـــــــەوی

نوێژێکی بە یادی بلێسەوە دانەبەستبێ.

ئەوانەی درویّنـەوانی رابـردوو، رەنجبـەری

یەستاکە نەبن

بە چیەوە شانازی بە ئەوین دەکەن؟

بە دەمە دەمەدەمی رۆژئاوانان باوەڕ بیّ

لە کەل هاتنەدەر تاقەتی دەویّ و

ئیّمە میّژوویەکە ئەدرەوشیّینەوە لە گەڵ مەرگ.

بڕوانان بە پشووی سواری باران بیّ

شین بوونەوە ویرانی دەویّ و

ئیّمە لە گەڵ باویّشکی سووتان چرۆمان داوە.

وەی وەی وەی لە ئیّمەی بە تەنیا

مەخابن ـ بۆ زۆرهانی هەناسە ساواکانمان.

ویرە ویر ـ با ـ بە مەملەکەتی گۆرانیدا رادەبریّ

میژوو بە ساڕای هەناسەکانماندا.

تەنیایی لە گەڵ ترپەترپەترپی دڵمان

دەهۆڵێکی ناوادە دەکوتن.

بەهار ـ خۆ لە قەرەی ئەفسانەی سپی سەخڵەتی نادا

ساڵ ـ بە چۆک دادێ لە بەر دەم نوێ بوونەوەی

هەنگاوەکانی ئاوێنە و

کوێرە ڕێگای خەونی گوڵان.

کۆن کەوتین ، ئێمە و گوڵە قەیرەکانمان ـ کۆن

کۆڵماندا ، لە گەڵ بیستنی

شانۆنامەی جادوو بوون.

دوایین مژی هەر جگەرەیەکم پێشکەشی سیبەم بکەم

نزیکتر دەبمەوە لە گەڕەکی تابووت

دوورتریش

له کۆڵانی جریوەی پاساری بزە.

یەکەم ماچی خەیاڵی لەیلەکەمم له بیرەوەریمدا نووسییەوە

هەنگاوێک بە سەرهانی خۆمم بۆ بەهار سووتاند

فەرسەخێک له باوێشکی تەمەنی دایکم دوور کەوتمەوە.

هەر نزیک بوومەوە و

هەر دووریش کەوتمەوە و

ناگەمێ ـ ناوەندەکانی

سۆز

دووری

دووری

دوورن.

وەرە ـ گوێ نەدەینە فاڵچیە چاو گەردوونیەکان

هاکا یەکمان دێتەوە لە کۆشی دەربەدەریدا و

تەمەنمان بۆ رام نەبووەوە.

پیرە ئەوین، گوێی لە باس و خواسی هەڵفڕینمان

نابێ

شێتە مرۆێ، بیر لە، لە کیس چوون ناکاتەوە

با رێزدانێین بۆ ئێمەیەکی بەردەوام

با هیچ هەناسەیەکتم لە کیس نەچێت و

هیچ باس و خواسێکمان بە کاڵی نەوەرێ.

لە گەڕەکی‌ون بوونما شێتی گەرای داناوە

لە مەداری سەرما، مەرگ بارگەی خستووە

لە رووباری خوێنما، ئەوین پاپۆڕەوانە پیرەیەو

دەمگێڕێ بە کۆڵانەکانی غەریبی‌دا

دەمبانەوە بۆ بەندەرەکانی شێعر.

لە وڵاتی پەپولە قەیرەکاندا

چاوکاڵەکەم...قاقا...قاقا....قاقا...شاعیرەو

من...هوون هوون...هوون هوون...هوون هوون...ئاوارەم.

سڵاوتان لێبێ شێعرە ئاوارەکانو

وشە دەربەدەرەکانی غەریبی.

سڵاو....

دوایین راسپاردەی پێغەمبەرێکی شێت و ئەویندار

لەوە بەدوا...دڵم لە هەموو شێعرێک یەشاوە ـ چاوی وشەیان ماچ ناکەم

هەموو رۆژێ....سەردانێکی گریان دەکەم ـ هەڵبەت ئەگەر ومڕمز نەبێ

بە میوانی....دەچمە حەوشەی مردنەوە ـ هەواڵی گیانی گیانیمە.

لەوە بەدوا...شێتی شێتم

هەموو ڕۆژێ وت و وێژێکی تەلەفوونی لەگەڵ خوا دەکەم

ـ بەپشتیوانی ئەوینێکی ئاورینتر لە دۆزەخ ـ

نامەیەک بۆ خۆر دە نووسم

ـ بە دەستنووسی شەوە زەنگێکی عارف و

دەمە ئەویندارى باران ـ

سوورەیەکی نوێ دەخوڵقێنم ـ دەتوانم ـ بیخوێننەوە:

ا

١ـ ئـەلـف، هــێ، واو،

ێ، نوون....

٢ـ نیازی دڵدارانە قەت

بە دڵتانا ڕاخوشیوە؟

ئەوەی عاشق نەبێ

نیشتمانەکەی بێ ئاڵادەبێ

(ئەوە رای منە: لە ئایەی دووی سوورەی شێتیدا)

٣ـ هەموو سەرێک ـ دەبێ سکڵێکی گەشاوەبێ

ـ خامۆشی پێشکەشی دۆزەخ

٤ـ هەموو زوبانێ، دەبێ رووبارێکی بێ برانەوە بێ

ـ هەڵچۆڕان خەڵاتی خەفەت.

راستی گوت شاعیری سەرشێت

بەڵام کەس بڕوای نەپشکووت.

٧٧ی هەتاوی ـ تەورێز

ئەمڕۆ و دوێنێ و ئەبەدییەت

بێکەسییە، هۆی بێدەنگی خەڵووزاوی کات

دادەبارێم

له دەرفەتی بێ سەرەتادا

ورد

ورد.

تاقەتم بەشی پێکەنین ناکا

تەمەنم بەشی سبەینێ

دەخولێمەوە لە بێ تاقەتیەکی خەستدا

بە شایەدی هەموو ئەو بوونەوەرانەی

هەڵیان نەمژیوە هەوای ژین

نە لە دوێنێ و نە لە مڕۆدا.

نابێ

(بۆ لەبیر چوونەوە نابێ

ئەو کۆڵانەی نە تۆ پێیدا ڕۆیشتی و نە من)

**ـ داهاتوومان پێی دادەڕوا ـ**

ناژین

(بۆ ژیان نابێ

ئەو پێکەنینەی نە تۆ باوەڕت پێکردووە و نە من)

**ـ شەیتان باوەڕی پێدەکا ـ**

ئۆقرە ناگرێ بێ ئارامیم

ئایەتی ڕەسووڵی نەهاتیە ئەوەش

من و زەمانە نەهاتووەکان ئیمانمان پێهێناوە.

تکاکانم

لە خۆمەوە تا لای خوا زیاتر بڕ ناکەن

ـ لەوە کەم خایەنتر وشە ـ

ماچەکانم

دەمرن هەنگاوێک بەر لەوەی بەتۆ بگەن

ـ لەوە کۆچی ناوادەتر ـ

نازانم

بۆنی گوڵی ئەفسانەکانە یا چاوی داهاتوو

ـ نەفامیم خۆزگە ئەژاکا ـ

پیرە و بۆ هاوڕێیی نابێ زەمان

خۆشەویستیم لێ لێڵ دەکا

قەقنەسە

لە مەرگا ئەزێ

خۆی خۆی ئەبێ و

بەردەوام لە مەرگا ئەژی

پیرە و بۆ هاوڕێیی نابێ زەمان

خەونی پێغەمبەرەکانی پێش مانەمە: **خۆشەویستی**

لێکدانەوەی سێحرەکانی ئیبلیسە: **ئەوین**

کۆتایی مەرگێکی کاڵە: **سڵاو**

ئاڵۆزاو منیش

مردنێکی کاڵم

لەباخچەی وشەکانی دەردا

تۆ بلووغی بە ئاگای بەهاری و

رازی جادووبونی چاوەکانم

**ـ بەر لەوەی من سەوزاییەکان بدرکێنم ـ**

خۆزگە شێتی گێڕانەوەی رابوردوی بێ ئەتۆیی با

هەر تۆم هەبێ

دەیبینمەوە، بۆنی کوشتنی وشەیەک

ڕووانی پیتێک

کۆخە کۆخی خۆم لە ئێستای ڕاوەستاودا

تەنیاییم بە بەیان

تینوێتیم بە هەتاو

شێتیم بە شۆڕشی وەنەوشە پاراو نابن.

**ـ بریا تەنیایی تەعبیری هەڵفرین با ـ**

لە بێ زەمانیا: (پیری ئاسمان چەوسانەوەی پەریبیەکانمان بۆ باس دەکا

لە بێ هاودەمیا: (چرکەکانی تەمەنی ئارەزوو دەبنە دەنگدانەوەی سرووودی خەڵووز

بە گەردەلولێک وشەوە بەربینگی تەنیاییم بگرە

زامی تێکڕای غەریبیمان بخوێنەوە

شڵەژاوی پاساریەکان لەبەر بکە

گەرەلاوژەی ماچەکانمان بلێیەوە

پێش سڵاوی سەوزی دارو

ماڵئاوایی زەردی گەڵا،

درنگە، ژانی گەیشتن دەمسوتێنێ

ساڵ ـ شازادەی خەونەکانی شێتایەتی ـ زوو رادەبرێ

لەبەر دەرکی ساڵی نوێدا

تابلۆی هەناسەکانی خۆم هەڵدەواسم

رەنگی بێکەسیم بە دیواری وەرزەکانەوە ئەلکێنم و ئەنوم و

خوا بە غەریبی دێتە خەومەوە:

بە گشت تەنیاییەکانیەوە

یەک میلیۆنومی چرکەیەک لەلام دەبێ و...

بێدەنگی دینم لە چوار دیواری لەبیرچوونەوەدا بۆ دەگێڕێتەوە.

لەبەر دەرکی ساڵی نوێ دا

گریانێک کە زۆر تامی ماچی دایکم دەدا

دەستم لێ هەڵدێنێ

ئیتر ساڵ بەردەوام دەمرێ.

ساڵێکی چەند تەمەن کورت بوو، پێکەنینمان

وەرزێکی چەند جوانەمەرگ بوو، بزە

رۆژێکی چەند درێژ بوو، گریان

رابردوو ـ خەونی بەردەوامی ئەستێرە و تینوێتیە ـ و بیری لێدەکەمەوە

خەون دەستم لێ دەوەشێنێ

وشەیەکی مەیلەو مەرگ

شێعرێکی شێت

کیژێکی چەشنی رووبار کەڵەگەت دەبینم

وشیار دەبمەوە بەر لە مەرگی ئێستاکەم.

تک

تک، تەنیاییم لێ دەچۆڕێ

نم

نم، پەژارەم لێ دەوەرێ

لەت

لەت، شێت دەبم

مێژووی پەنجەرەم دوای ئەوین

تێکەڵە لەگەڵ مردنی پاساری

پێناسەی ڕووبارم ـ تینوێتی ـ

لە گێژەنی ژانی ئەویندا

شێعر پشووی سوارە و من

چ بەرز

چ پیاوانە وشەکانم خۆشدەوێ و

ناونیشانی خۆم لە «با خۆش مرووروەکەی» سەردەمی نەبوون وەردەگرم

فرمێسک (پشکوتنی من بە شنەی بێ نێوبی تۆ و باوێشکی دەریا

گریان (پێک گەیشتن لە دوایین وێستگەی ئارەزوو

سبەی (ماڵئاوایی و

ئەمڕۆ (سڵاو بۆ تەواوی ڕابردووەکان

ـ چ قاموسێکی نالەبار و شەکانم وەسوەسە دەکاـ

لە سەردەمی وەجاخ کوێری ـ با ـ و

تینوێتی مندا.

دوایین بیرەوەریەکانی ئەوین زەمان ناناسن:

ـ: تا دروێنەی گوڵ هەنگاوەکان دەپروکێن

داسی زەمان ژەنگ ئەهێنێ

ـ: تا چاندنی گوڵ

وێرانی باوێشکی ئاوەدانی ئەدا

لەرزی ژیانی بە لەش دادێ

ئێستا تک

تک مەست ئەبێ

سبەی خوڕ

خوڕ، دێ، تا دەگاتە بەر دەممان

سوێند بە نەگەڕانەوەی پەپوولە

من لە مابەینی ئەلان و ئێستادا تۆم دەوێ

بەڵام تۆ لە نێوان سبەینێ و ئەبەددا

ناتوانی فەرامۆشم نەکەی

رۆژیش نە من دەناسێ و نە تۆ

بێکەسییە هۆی بێدەنگی خەڵوزاوی کات

زستانی ٧٦ تەورێز

پەری دەریایی لە تەلاری ئاودا

]بۆ ئەویندار ی نیانی تەنیایی: فەڕشاد وەلیزادە[

ئەم تولّە گورگە برسیانە

ولّامی سلّاوی سامالّ نادەنەوە

دووشکن

لە سیخوڕی تاریکی و

ئاوەدانی، جیهانی سادەی فانووسێک

ئەم تولّە گورگە برسیانە...دەمرن

پێش ئەوەی من

شێعرێک بکەمە دیاری خەڵوەتیان

بەر لەوەی کە قەسسابەکان

گۆرانی هێمنی دەریا بلّێنەوە

بۆ برسێتی بێدەنگیەکان

ئەم ئەوینە بێدەنگانە

هەر خولیای ترس و لەززەتە

دەیانخانە شێویلکەی ئائەم رەسمەوە ]تۆ ئەی ئەوەی

ئەم شێعرەم دەبیستی

مانای هزر دەزانی بەرەو کوێ...کشان...

من ئەی ئەوەی ئەم هۆنراوەیە دەنووسم

مانای ئەوین

لەهەڵدێری کام تووڕە بوون دا...ون بوون..

ئەم تولە گورگە برسیانە

برایەتی قەسسابە دڵۆیانەکان، دەکەنە موسیبەت.

فوارەی خوێن، هەڵبەستی شەپۆلە ئاوارەکان دەخوێنێتەوە

هەناسەی زام، سەمای پەریلە داوێن پاکەکان تێک دەدا.

تۆ لە هەیبەتی باڵندەیەکەوە

بوویە

ئەو ئینسانەی تا قووڵترین قووڵاییەکان ڕۆ دەچێ

منیش لە شێوەی هەیولا یەکەوە

دەبمە

ئەو مێروولەیەی، ڕیسالەتی ئەوینی مەلەکە چاوڕەشەکان

دەربەدەری دەکا.

ئێمە لە شکڵی خۆمان دا

برایەتی ئەم تولە گورگانە ناکەین

ـ گورگ سەرەنجام هەر گورگە ـ

شەقەی نیوە شەوی شەممۆیەکی پێکراوە

بێ ئەوەی لە وەرزی هیچ ڕۆژێکی ترا

باسی ساڵی ئەوێنتم پیر کردبێ

بێ ئەوەی تولە گورگە برسیەکان

موتاڵایەکی دڕندەییان

لە ژێر نووری کۆخی پەپوولەکان دا شنیبێتەوە

باران نەدەباری، تا کورت بوونەوەی رۆژەکان بسەلمێنێ بەشەو

نەچیر هەڵنەدەستا، تا بەستەزمانی ئەم تولە گورگانە قەدەغە بکرێت

کەس لە حەیس و بەیسی رووح سووکی باران ناگاو

کەسیش لە دۆدی و بۆدی مەرگ تێر نابێ

تێکڕای ئەو رۆژانەی بەبێ من و تۆ ئاوا بوون

بەشەهید دەناسرێن

هەموو ئەو گورگانەی بەدیار توانەوەی دڵتەوە دەمرن

بە برسێتی تەڵقین دەکرێن

**دەلووریێن:** بە رووی مانگە شەوی شەرمنی سەرەتای پاکییەوە

چ بێ شەرم!

**دەوەرن:** بە بێکەسی من و هاوولاتیانی یەکشەممۆ

لە کۆلانە پێچاوپێچەکانی هەستیدا

بەشوێن شابانووی ئارامشەوە

لەگەل مەیتەرەکانی رووناکی پیر بووم.

گورگ شالاوی شابانوویان داوە:

چ بێ شەرم!

شابانوو دوایین جگەرەی پەرێشانی

لەنێو گلێنەی منا ئەکووژێنێتەوەو

قا...قا...قا....قا

بەو گەمیەوانە پێدەکەنێ

مـــنی بـــەرەو كۆڵـــانەكـــانی مـــەرگ

خۆشئەویست

ئەم تولە گورگە برسیانە

شەڕابی دڵی دایكم دەخۆنەوە

ـ وێڕای مەرگ ـ

ئەویش بە مەمكی پیرۆزی

شیر ئەدانە وەچەی گریان

شابانوو خەریكی گوڵدۆزی كردنی دڵمەو

دایكم كۆبەی نەدامەتی دەگرێ...

دایكم شابانوونیە... دەستە خوشكێتی

هەرگیز پێڵاوی یەكتری لەبەر ناكەن

ـ بەڵام ـ

شابانوو كڵفەتی پەژارەكانی دایكم دەكا

ـ کەچی ـ

ئەو هەموو زەڕنەقووتەکانی هیچی پەروەردە دەکا.

من و تۆ و دایکم و تێکڕای ئەوانەی خۆشمان دەوێن

(تایەفەی مەرگین)

ئەو و تولّە گورگەکان و نەیارانمان

(قەبیلەی پەشیمانین)

**ـ هۆزی شەڕخوازی ئەهریمەن، دوورمان دەخەنەوە لەیەکتر**

**هۆزی شەڕخوازی ئەهریمەن ـ**

سەربازەکانی تاریکی دەسڕێژ لەو پاساریانە دەکەن

لەسەر سفرەی دڵم دانی پێکەنینیان دەخوارد.

قاڵاوەکانی برسێتی

لە کاکەشانی بەینی مەمکەکانی تۆدا

هێلانەیەک لە بزەی خەفەت ساز دەکەن

**ـ باڵندە بێ لایەنەکان خۆیان بەشەرمەزاری ئێمە دەزانن، باڵندەبێلایەنەکان ـ**

دەربیجەکان، بەرووی هەتاودا ئەنووسرێنەوە

شەقامەکان، بێدەنگی دەپێون

من ئاوازی دڕندەیی دادەگیرسێنم ـ لە چاوی بەورە کانەوە

شەیتان ئەویندارانە بۆن دەکا بە خوێنمەوە

دڵم سەربزێوانە تۆقی لەحنەت دەکاتە دیاری بیرەوەریەکانم

من سوجدە بۆ هیچ بیرەوەریەکی رەش نابەم

با یەزدانێکی ئەویندار

چەمۆڵە لە تەوێڵی کەسایەتیم نێ.

ئەوانەی لەسەنگەری مەستیدا

دەسرێژ لە ئینسانیەت دەکەن ـ ناشاعیرن ـ

لە قوولاییەکانی بێهۆشیدا خۆشەویستی دەبێتە وشە

من لە دەریای بێهوشی دا

خۆشەویستیم دەکەمە وشە بۆ شێعری بالآت...

دایکم راوێژی درێژی خەفەتێکم بۆ...ئەپشکوێ

ئەو...باران ماندوودەکا لە بارینداو

لە دووکەڵی جگەرەکەیا..ون....ئەگیرسێ

ئەم لە ئەوینی من دەدوێو

من باسی دەستە پیرەکانی ئەو

حیکایەتی ئەوینمە.

ئێمە دەبێ وەک هێمنی باڵندەو

وەک سیحری هەڵفڕین تێکەڵ بین ـ دەنا ـ

دەنگی کۆڕی پشیلە شەڕانیەکان و لوورەی

برسێتی

شەپۆل دەخاتە هێمنایەتی باڵەوە.

ئەگەر تاریکی مانایەکی نەبێ

بێگومان پاساریەکان

سەریان لەلێک دانەوەی هەڵفڕین

سوور نامێنێ.

من تریاکی نەدامەتی شەو ئەکێشم ـ بمبوون ـ

چ موعتادێکی پیرۆزە شەو ـ بە تاریکی

چ مەستێکی بێ ئۆقرەیە رۆژ ـ بە رووناکی.

ـ وەرەئێمە مەستی شێعرو موعتادی بزەبین

ـ

حەبیبە حەبیبە حەی...لەو خەونەم

تۆی تێدا ی

: من تۆم وەک مارماسیەک هاتە بەر چاو

لە تەلاری ئاوێک دابووی

تێکەڵت بووم و پێوەت دام.

تۆم وەکوو پەریەکی دەریایی هاتە بەر چاو

باڵت بوو بێ ئەوەی بفڕی

من لەچاوت دا بوومە مەل..

سەمایەکت کرد ـ یەزدان فێری کردبووی ـ

(ئایەی سەما)

قاقایەکت بۆ ڕاداشتم

(سووڕەی ئەوین).

ئەمشەو بەر لەوەی نهێنی ئەوین بۆ یەکتر بدرکێنین

بەر لەوەی ماچێکم داوێنی گرتبێی

تۆ پەریەکی دەریایی بووی...لە قەفەسی گورگەکان

دا...

هاوینی ٧٧

سروودی نەتەوەیی وێرانی

کوا ئەستێرە؟

ئەوە چرای ماچی منە گۆرانی رووناکی ئەژی

کوا باڵندە؟

ئەو جریوەی بێ ئۆقرەی لێوی منە، لەلەپی وشەی...، «لەیلی»دا

باوێشک ئەدا

کوا دارمان؟

ئەوە خاپووری دیوارەڵێلە کانی ترسە لە باوەشی ئێمەدا

ئاوەدانی پێدەکەنێ

چ سەفەرێکی دژوارە چوونە نێو شۆڕشی رەشی دڵێکی سوور!!

چ کۆمارێکی لەرزۆکە مەستی شێعرو گارەی پاییز لە کارنەوالی گەڵادا.

ماچێکی چەند ئەبەدییە

زامی نەهێنی گۆرانی پڕلە خورپە.

لەگەڵ ئێوەمە هۆ خەڵکە

بیر لە ئوستوورەی هەڵوەرینەدا مەمرێنن

ئەوە داری باڵای منە

گەڵاریزانی ماچی گرتووە

لەباوەشی دیکتاتۆری ـ پاییزی خۆشەویستی...دا

ئەوە هەوری سەری منە دەگرمێنێ

نەک برووسکە

لەسامالی بزەیەکی ئاهوورِایی ئەوینمدا

بەشوێن تەوافی پەری ئەوین دا

ئاوا بوون و هەڵاتنتان

بەربەست بکەن

هیچ پەریلەیەک نابینن بە خەو نەبێ

ئەوەی دیتان

پەریلەی هەڵچوو ـ لە سەر پەیژەی رووحم بوو ،

لەپەرستگەی تەنیایی وشە گەرِاوە.

هیچ برینێک سارِێژ نابێ بە بێ ئەوین

ئەوەی بیستان

لێڵاوی دوایین خەونی خوێنی دڵم بوو

له شەڕگەی پەپوولە سەفەرییەکانی غەریبی ماچ بەجێمابوو

بە جێم بێڵن

لە مێحرابی ئەفسانەیی سەر شێتیدا

دەمەوێ منارەی باڵام ـ لەسوجدەی دوو ركات ماچدا

وێران بكەم

چ ئاوەدانە ئەوینم

بە جێم بێڵن

دوای سەمای گومانی مردن لە تەلاری رەشپۆشی ئاوێنە کاندا

گەرەکمە ـ لەپرسەی سانە بێ ماچ کەسیرەکانمدا

شێعرێک داگیرسێنم

لێڵترین قافیەی دۆزەخ بێ

چ سەربازێکی پیرۆزە لێوم ـ لەنێو كارنەواڵی ماچ و هەڵومریندا

چ چەکدارێکی ساویلکەیە ئەو دڵەم

لە بەربەیانی ترس داو

چ میرێکی نەترسە ئەو ئەوینە سوورەی من

لەسەر تەختی ئەرخەوانی رازاوەترین سانەکان

فەرمانی مەرگم ئەوەرێ

میری سەوزی گومڕایی هەرێمی دەریا!

ئایەتی شەپۆلت حەرامی ئەو ماسیانەبێ

نەیانزانی سوورەی سەر چاوەت لەبەر کەن

سەرکردەی ئەرتەشی تەنیایی ئەوینم

دڵنیابە لە کوودتای بەکۆمەڵی پوورەی پەپوولە پیرەکان

من ژنراڵی وەفاداری ئێوارەکانی دڵپڕی ـ تۆ و یەزدانم

سەفەرنامەی هەناسەیەک بنووسەوە

بەرینتر بێ لە نیشتمانی گەردەلوول

ئاڵات لە نیشتمانی گەردەلولێکا هەڵکە.

خودموختارتر بێ لە دڵم

خودموختاری دڵم کاتێ بە پیرۆز بناسە

وتووێژی من و تەنیایی دەبیستی

ـ هاووڵاتیانی بێکەسیم!! بەیانیو باش

ـ ژیانت باش

تەنیاترین وشەی سەردەم

ـ کیژوڵانی بەرامە و بلووغ و باران

مەمکەکانتان پڕی شکۆفە و ئەوین بێ

ـ پڕی بەتاڵی پەنجەی تۆش

ـ چەکدارانی تاریکیم و دەربەدەریم!

بەردەوام لە لێڵی دابن.

**یەک ـ دوو ـ یەک ـ دوو**

**بەڕاست ـ راست**

ئەمن ژنڕالی بێکەسیم

من سەرکردەی لەشکرێکی شکست خواردووم

من حاکمی ئەو هەناسانەم لێم یاخی دەبن

من رێبەری بزۆزترین مردوەکانم

**یەک ـ دوو ـ یەک ـ دوو**

**بە چەپ ـ چەپ**

بێ جووڵە راوەستاو گومڕایی لە دوای یەک

بێ بزە هەڵوەریو هەناسە

بێ مەرگ رازاوە تابووتی غەمناکی ئەوینی سەبوورم

بمبوورە ئەی یەزدان

بمبوورە ئەی خەفەتبارترین حاکمی ئەو دڵەم

ـ ئەی سەربازانی تاریکیم گوێ بگرن

من سەرکردەی ئەویندارانی رەبەنی دوورەماچم

من کاشفی دووئەستێرەم بە ئاسمانێکی کورتە باڵاوە ـ پێدەکەنن

من حاکمی بزەیەکی بەر دەوامم

راوەستن ـ بێ جووڵە ـ سەراپا ببنە گوێ

هەر خورەی رووباری ماچە دێ و

هەر هەناسەی شەهیدی دڵم ـ

بۆ ناوەرن ـ ئەی گەڵاخۆش ئیقباڵەکانی پاییزی

بۆ نابارن ـ هۆ خەفەتە سەرمابردوەکانی دڵم

بۆ ناسرەون ـ هێی وشەکانی تەنیاییم

سوێند بە شەهادەتی دوایین ساتەکانی تەمەنی

جگەرەیەکی نیوە سووت

هەر دووکەڵی غوربەتیە مەوعیزە بۆسەرم دەکا و

هەر سۆمای کزی سەفەرە

دوورو دوورتر دەبێتەوە لە نامۆییم

دڵۆپ ـ دڵۆپ ـ دڵۆپ

(سڵاو باران)

گەڵا ـ گەڵا ـ گەڵا

(فەرموو پاییز)

شەپۆل ـ شەپۆل ـ شەپۆل

(ئەتۆش ببورە شۆڕەکات)

خەونەکانم ـ شاعیرترین ساتەکانی
ڕەشایی شەو

شەوەکانم ڕەشترین شیعری زەمانە

زرینگ ـ زرینگ ـ زرینگ: (ئەمە زرمەی دەهۆڵی شەڕنیە
سەحەری لە شکری شکست خواردووی بزەکانی
منە

تێکڕای سەربازەکانی تەنیاییم ـ بێ جووڵە ڕاوەستا
و

لە جێی خۆو

بۆرێزی تەنیایم

بۆ شکۆی بێکەسیم

بەراست ـ ڕاست

ئێوه ـ ئەی فەرمانبەرانی ئەهریمەن و وێرانی من

ئیوه ـ ئەی سەربازەکانی گەمژەیی و پەژارە و خۆم

ئیوه ـ ئەی جاسووسەکانی ئەوین و گەشاوەیی و دڵ

تا دوایین دڵۆپی هەنیسک و

تا دوایین چرکەی دڵ

سروودی نەتەوەیی گومڕایی سلوولە کانم بخوێننەوە...

ئەوەیە فەرمانی گەزیزەیی شکۆدار

ئیمپراتۆری سپی پۆش ـ زستان ـ

ـ زووبن دەی :

ئێمە ئەی خۆشەویستی پڕ لە مەرگی بێپرسیار

سەر سووڕمان دەخوازین

ئێمە ئەی نەتەوەی سەفەری خوێناوی لەمەرگا

خاپووربوون دەپێوین

ئێوە ـ هۆهۆزی ئەویندارى دووره ماچ

گریان ئەدەڵێنن

با بژی وێرانی برینمان

بەردەوام هەر بمرێ ژینی نوێ

ـ بەیانیت باش ـ ژنراڵی عاشق و وێران

مەرگت خۆش سوقرانی دووپاتەی زەمان

ئێمە سەربازانی شەوکەرانی رەنگی تەنیاییت

ئێمە چەکدارانی بەتاڵی و هیچیت

رزگاریت ئەخوازین ـ بەردەوام ـ

پاییزی ٧٨

خنکان

هۆ هەنیسک

گەورەکچی سەردەمی هەڵچوون

مەملەرزێنە

ـ کەمن لەرزیم تۆ دەخنکێی ـ

بەردەوام بە وەکوو کانی

هۆ کیژەکە

- کەتۆ سروودی کۆتایی بڵێییەوە

من دەخنکێم -

١٠/٥/٧٦ بۆکان

ئایەت

زەخمە خوێن دەبیستێو

چاوەشینەکانی من دەچڕێ

شەو

لەهەر چوار لاوە دەلاقەی خستۆتە سەر پشتو

ئەندێشەی من؛ دەمرێ

دونیا

کۆن، کۆن، کۆنە

خودا روون دەبارێ و

رووحە شێتەکەی من ئایەتی نوێیەتی

١٢/٢/٧٧ ـ نەورێز

بەردەوام

ئاسمان دەڕژێ وەک دڵۆپە

باران

ـ با ـ

تاو

زەوین دەسووڕێ وەک **دڵم**

دەگریم وەک وشە..... **چاوم**

پێغمبەر فوودەکا بەسەوزی چاومدا

بەردەوام خوا ئەژی لە قووڵی دڵمدا

زەمان، وەک مەرگ مردووە

حەللاج ماوە کێوەکان بکاتە لۆکە.

١٢/٢/٧٧ ـ نەورێز

ئامـاژەی سەرسوڕمـان

سێبەر لە سێبەر دەهـاڵێ و

تیشک لە تیشک هەڵدەکەوێ

مەرگ نیشـانەی پرسیـار لەبەردەم من دادەنێ

تۆ ئامـاژەی سەر سوڕمـان لە دەروونمـا

من لەمەرگ دەهـاڵێم و

تۆ لە بزەیەکی بێکۆتـا هەڵدەکەوی

١٠/ ٣/ ٧٨ ـ تەوریز

تاڵ (١)

وەرە دەری

لەدایرەی نووسینەوەی شەوکەرانی وشەکانت

با تاڵ نەبی.

تاڵ بباری

بەهارەکانمان کۆچ دەکەن

ئێمەش دەبینە تەعبیری خەونێکی تاڵ

وەرە ژووری

بۆ چوار گۆشەی چیرۆکی شەوو

من و

خۆت

ماچەکانمان زۆر دەمێکە بێ ناز کەوتوون

١٠/٥/٧٦ـ بۆکان

شەیتان

شێتە زەمان

لاڵە بەهار

سەوزە مەرگ

سازی شەیتان گوێ نادەمێ

سازی پێغەمبەر نابیستم

سازی ئەوین بڵێسە بە رووحم دادەکا

ئەگەر

خودا، خودا، خودا

لەم بەهارە زەمانەدا نەمرێنێ.

۷۷/۲/۱۲ ـ تەورێز

دوو (١)

پیرۆزترین بەفر، نەگبەتترین سەرما

ـ لەو دوو هاوالّە لێک ترازاوە چارەنووس بەستی

میهرەبانترین خودای سەرزەوی، دلّڕەقترین شای پانتای جەهان

ـ لەو دوو ڕێبەرە لەیەک ئالّاوە، ژیانمان ئەدەن بەدەم هیچەوە

رازاوەترین رکەی بەهارو، گەشاوەترین مردنی زەمان

ـ لەو دوو دژانە، حوکمی زانی گشت بالّندەکانیان ئیمزا کردووە

منترین من و، مەرگاویترین مردنی زەمان

ـ لەو دوو برالە پشتاوپشتییە، میراتی باوکیان بەش نەکردووە

٧٦/١١/٣ - تەورێز

هیچی

بەوبەیانە؛ بەو هەتاوە، بەو ئەوینە

نەمن تۆم دەوێ، نەتۆ بێ من سڵاوێک

ئاراستەی تەنیایی دەکەی

بەو شێعرە، بەو نووسراوەیە، بەو هەوایە

نەتۆ دەباری

نە من گریانێک دەمنووسێتەوە

ـ درێژە بە شنینەوەت بدە، هیچی

لە بۆشایی نێوانماندا ـ

١٠/٦/٧٨ ـ بۆکان

!

ئەڵماسی هیچ بزەیەک نەخشەی خەڵووزی ویرانی دڵم...

ئەو رستەیە تەواو نابێ بە دڵپڕی

ئەڵماسی ویرانی بزەت کە خەریکە چاوەکانم...

ئەو شێعرە درێژە نادرێ ئاوا بەهەست

هزر دەڵێ: ئەڵماسی ئەوین درۆیە

٧٨/١١/٣ تەورێز

ئا

سێوی سووری بزەت (باخەوانم)

شارێکی ئاڵۆز لە چاوتنا (چەند غەریبم)

باخەوانێکی غەریب ئەویندارە

چ ئاڵۆز

سێوی سووری دڵی گازی لێگیراوە

٧٨/٢/٢٧ تەورێز

تەنیا

سەربەخۆیی من لە مێژە پەسندی نەمان کراوە

تەنیا ژیان

ژیان، داستانی مانەوەی نابڕێتەوە

ژیانم لە مێژە پیر بووە و دەمرێ

تەنیا شێعر

شێعر، بەسیحری پێکەنین زیندووی ڕاگرتووە

شێعر لەمێژە بۆتە شۆڕەکات و

تەنیا تۆ

تۆ، هەموو ڕووبارەکانت بەرەو ژووری وشەی من بانگ کردووە

١٠/٣/٧٨ تەورێز

دوو (٢)

شەو شەپۆل ئەدانەوە لە ژیانتدا

(بەلەمی نیگامت بۆ دادەگیرسێنم)

زستان لە مەمکەکانتدا هێلانەی کردووە

(شەمی ئەنگوستەکانمت بۆ ئاور دەدەم)

دوو تەنیاین لە دوورگەی بێکەسیدا

(سەوڵی هەنگاوەکانمان پێکەوە دەبزێوین

بەرەو کەنار)

٢٨/٣/٧٨ ـ بۆکان

وەک

به شێوازی عارف (چ زرمه زرمی دەفی دڵێکه

چەشنی شاعیر (ئەو سەروایانه لەمەرگ بستێنێنەوه

وەک باڵنده (رکەی زەمەن تێک شکاوه

من باڵندەیەکی شاعیر و

عارفێکی باڵندەییم

به شێوازی عارف ـ دەف

چەشنی شاعیر ـ سەروا

وەک باڵنده ـ سنوورەکان

تێک دەشکێنم

رەها

لە ژوانی کۆتایی مەرگدا

لە ماچ و مووچی جیایی و هەڵپەدا

**(سێحری وێران بوونی شەقامەکانی روانین**

**جەغزی پساوی هەناسەکانی زەمان.)**

لە کۆتایی هەموو پەرژینێکدا

بە دەم بزووتنەوەی گشت هیچێکەوە

**(مەیلی ساردی پێکەنینێک تا سەر لێوم**

**ئیشتیای سڕی مەستیەکی پڕ لە جادوو).**

لەکۆتایی ئەم شێعرەش دا

هەموو هەوڵێک بۆ ئاسایی کردنی وشە

گەییە بون بەست

رەهای رەها

لەگەڵ مەرگ.

فتبارک الله احسن الخالقین

مەمکت خەواڵووترین نیانی ئەبەخشێتە پەنجەم

نیانیترین خەو لەسەر مەمکت

پەنجەکانم داگیر دەکا.

داگیر کرانی ئەوینم

ـ ئەگەر دڵم تاقەت بێنێ ـ

هەر دەبێتە وێرانی مەمکەکانی تۆ

مەمکت فینکترین بزە دە خانە دڵمەوە.

١٥/٨/٧٨ ـ تەورێز

من و بوودا و تاریک

لە ژێر سێبەری داریBO

ژیان چ ژانێکی بەردەوام

ئەپژمێ.

لە ژێر گەڵای چەوسانەوە

بۆ گەیشتن بە رازی پیرۆزی مەمکت ـ بەحەقیقەت ـ دائەوەرێم.

هەتاوێک چەشنی هەڵۆ لە هەڵفڕیندا.

سووتانم چەندە نزیکە و چ تاریکم بە شوێنتدا

لە ژێر سێبەری داری BO

وەک سیزارتا.

ئەبیسرێم

شازادە خەونی ئاسک دەپێوێ و

مەمکی تکەتک

(ئەلەرزم ئەمڕۆ

شازادە چاوی مێژوو دەردێنێ و

روانینی چڵچڵ

پێئەگەم ئەمشەو)

]چڵێ لە مێژوو چاوی شازادەو

تکێک لە ئەمڕو و خەونی پیرۆزی[

شازادە تاجی دووری لەسەردا و

من لێرە تکەتک

بەسەر چڵ چڵی

مــــەرگـــــا

ئەبیسرێم

پیرتر

ـ با ـ وێرانترە لە شنەی شاخ

ـ ئاو ـ تینووترە لە خوڕەی ئاگر

ـ من ـ چڕتر لە تەنیایی دارستان

ـ ئاسمان ـ پیرتر لە شینایی مەرگ

**ـ چ دونیایەکی تەبایە،**

**تەمەن ـ**

ئاسمانی من تینووترە لە ـ با ـ

تەنیاییم وێرانترە لە ـ ئاو ـ

شینایی مەرگ پیرترە لە ـ ئاگر ـ

**ـ چ شێعرێکی سەیرە باران ـ**

١٦/٣/٧٨ ـ تەورێز

ویران

هەندەسەی شێعر تێک دەشکێنم

بنەمای روانین

ژمارەی سەروا

هەندەسەی مەرگ بنیات دەنێم

وێنەی هەناسەت

ژمارەی بزەت

تا (١)

تا فەرامۆشی نهێنی مەمکت هەتەر دەکا بیر

تا فەوتان.

بیری فەرامۆشی فەوتان، بێ مەمکت

کە مەحاڵ

کە درۆ

تا مەحاڵی مەمکت درۆزنی پەنجەم

گەڵا

گەڵا..پاییز

نهێنی پاییز، تا فەرامۆشی هەتەر دەکا

تا خۆم.

من هەروا لە چاوتا ـ من هەروا

سەرسوڕمانی حەقیقەت و دارژانی بزە

دادەڕژێ سەرسوڕمان وەک بزە

دەبارم وەک ترس لە لەشتا.

لە چاوتا من نەمنم

وەک سەرسوڕمانی خۆم

ئەو كاتەی دەستی تۆ

ئارامی ئوقیانووس بۆ سەرم

ئوقیانووسی ئارامی لەشت وەک دالّدەی سەرسوڕمان

دادەڕژێ بۆ دوورگەی باوەشم

سەرسوڕمانی حەقیقەت و دارژانی مەرگ

وەک دوورگەی حەقیقەت لێوڕێژی مەرگم من

تەنیا هەر رژانی بزەتە ئاماژەی سەرسوڕمان بۆ دڵم

لە دوورگەی بزەت دا تەنیایی لیۆریژە لەمن و

من هەروا لە چاوتا کەبارین

لەلەشتا

کەمردن

مـــن

هەروا....

دوو (٣)

باڵێک هەژان، باڵێک ڕۆچوون

: باڵندەیەکی دژوار بۆفامی زەمان ـ من ـ

چاوێک ئەوین، چاوێک بزە

سەرچاوەیەکی زوڵاڵ بۆ شێتیم ـ تۆ ـ

باڵندەیەکی زوڵاڵم لە هەڵچوونی ئەویندا

ئەی باڵێ لەشێتی

چاوەیەک لە دژواری زەمان

شکست

چیها گۆرانی لە شکست و سەرسامیم

چیها تەنیایی لە شێعر و دڵم

چیها خودا لە تۆ و تۆدا

شاراوە

سەرسامیم شاراوەترین گۆرانی شکست

(چیها شێعر لە تۆدا)

تەنیایی خودایی‌ترین گۆرانی

(چیها شارانەوە لە دڵدا)

ــــ هــەر درێــژەی خۆمــە ئــەو

دووکەڵە سەرسامە

ئەمسوتێ وەک

پەیێ -

پەیێی سووتانم لە ئەبەد دا

چیها تۆ دەخوازێ

ــــ هــەرپێــوەنــدی خۆمــە ئــەم

شاراوەییە

ئەمهۆنێتەوە وەک خودا

-

خودای شێعرم لە ئەزەل دا شاراوەترین تۆ

چیها گۆرانی لەشکست و سەرسامیم

لەتەنیایی و شێعرم

چیها خودا لە بزەت دا

که بەرز، بەرز تاقوولاَیی

کەشەو

تۆ ئەی خودای تاریکی ئەهریمەن

تۆ ئەی من (کە زۆرێک لە ئەوین

ئەی دووری (کە زۆرێک لە مەرگ

سلاَو ـ (کە بەشێک لە جیایی

گشتێک لە ئەمڕۆ.

تا خۆت

سەرەتایەک لە من تا ئاوەدانیەک لە تۆ

تۆ سەرەتایەک لە ئاوەدانیم.

من ئاوەدانی ئەوینت ـ کەمەرگ

تۆ مەرگی ئاوەدانی ئەوینم ـ کەدووری.

تۆ مەرگی من ـ تا ئاوەدانی سەرم

تا خۆت

سـەرەتایـەک

لەمن داگیرساو

کۆتاییـــەک

لەتۆ ، سەوزی سەوز.

---

تۆ لە نێوان بیعسەتی گوناهو

رەسووڵی تاوان دا

ـ کە مـن پێغـەمبـەرانـە

بمرم

ئیمـــانی کـــێ پـــڕی

سروودی ئەهریمەن؟

من لە سۆنگەی تاوانی ئەهریمەنەوە

تا بیعسەتی رەسووڵی گوناهDEL

تانۆ

ئەویندارانە سێو....

ئەویندارانە، ماچ

دووری... دوور

ئەستێرەیەک لەمابەینی ئەفسوون و ژیاندا

کەدادەکشێ بزەت

بەلەمێک لەسەر لەرەی هەناسە و داخورپان

کە دەجریوێنێ مەمکت.

دادەخوشـــــێم تـــا
قوولّاییت

ئـــــــەی
ئوقیانووسیترین رووناکی

لەنگەر دەگـرم
لە سەربزەت

کـــە
خنکان، کە نەفەس، کەشەهید.

ئەوکانەی لەمابـەیـن ئـەسـتێرەی
مەمکت و

بەلەمی نیگات دام

دووری....
دوووور

دادەمرم

تا ژیان.

مەرگ ـ سوێند بە یەکەم هەنگاو

گریان بەڵگەی ناوێ تا باڵندەکان ماندوو

تا سەفەر بەرەو نەبیسراو

تا بۆچی گەڕانەوە نابارێ و...

ڕەنگـــــە زۆر باڵــــندە

بەڵگەی گریان

کەماندوو نـەبیـسراوی

سەفەر

که ناباریێ، گەڕانـەوەی

بەڵگە...

مەرگ ـ بەڵام ـ ماندوو، خۆی سەفەرە

بەڵگەی هەموو گریانەکان

که باڵندە، لەبیری دەچێتەوە هەڵفڕین

مەزەی ئاسمان

که سەفەر، بەستزمان نەزۆکێکە

ناباریێ....

مەرگی گریان...بە مەرگی باڵندە قەسەم...بەڵگەی گەشە

که شێعرم گەش

که ماڵم خۆش

کەمردم...ئێوە خۆش

مەرگی گریان

بەمەرگی ئێوە سوێند.

من جەنگەڵ...

کە گەڵا تەعبیرێک لە ناوادەی وەرز

سات....چ زوڵاڵێک لەمن

کە وەریم

تا کووچە فەرمووی پاییزی پیرۆز

کە ژیان تەعبیرێک لە کۆچ

.....تاگەڵا

هەردەبێ ناوادەی پیرۆزی ژیان بم

لەوەرین

کە فەرمووی پاییز و

من جەنگەڵ

لە کۆڵان...

تا (٢)

کام شێعر مەگەر لەمەمکی تۆڕا

دەتکێتە سەر...

کام وشە کە لە ئەوکتا ئـەڕژێتـە

ناو...

کام ئەوین لە دڵتا

ئەشنێتەوە

لە دیوانی لەشتا شێعرێک

لە خەزێنەی ئەوکتا قامووسێک

لە دەشتی ئەوینتا تۆفانێک

(هـەرچـی هـەیـە هـەر

پێوەندی من و گومانە

من و مان.

هەرچی دەبێ ـ ببێ

کام شێعر لـە

قامووسی تۆفانا

پێـوەنـدی بـە

مەمکتەوە نیە

تا وشە

تا ئەوین.

داگیرسان

لە دۆڕانی زەمانمدا، بوومەلێڵێک

لە هەڵومرینی تۆمدا، زەمانێک

لەبوومەلێڵی دۆڕانمدا، تۆیەک...

کەشێعر تۆ وەک بوومەلێڵی زەمان

داگیرسێنیێ

من هەڵقرچانم ئەرۆێم

تـــا

هیچ

تا ئەو پەڕی خۆم.

دامدەگیرسێنی کەدۆڕام

تا هەڵوەریـنی بوومـەڵـیڵ ـ لـە

زەمانما.

تەنیا هیچ

شک دەکەم، لە گوماناوی بوونی ئەوین

دوودڵم، لە خاپوور بوونی ئاوەدانیە مزرەکانی

پرتەقاڵێک

گێژم بە کوێرە ڕێگاکانی دەریا دا.

تەنیا ئەوین.

هیچ پرتەقاڵێ مزری خۆی بەرێگای دەریا نابەخشێ

تەنیا گومان

هیچ باخێ بەری تینوێتی ناگرێ

تەنیا هاوڕێ

هیچ ڕووبارێ ڕێگایەکی خاپوور، بەرەو دەریا نیشان نادا.

تەنانەت

ئەوینی تۆ نەبا کوا هەتاو

وازی لێکدانەوەی نووری دەبوو

(تۆ مانگێکی گیراوی شاعیری

بێ هیچ بزەیەک ـ تەنانەت ـ

بی هیچ دڵێک نامپێوی)

من چۆن لێکنەدەمەوە ژیانم

کەخەونێکەو

خۆشم کە شاعیرێکی ـ تەنانەت ـ

بێ دڵ و بێ بزەو بێ هیچ

**ـ ئەوینی مانگێکی گیراو، ئەسیری پەنجەی هەتاوی**

**کردووم ـ**

کـۆتایی

کە ماڵئاوایی هەرچی دەرفەتە دەژمێرێ

من چۆن تا کۆتاییم ـ ناپژمم؟

چۆن پژمینی ماڵئاوایی دەرفەتم

کۆتایی ئەزێ...

کە پژمینی دەرفەتم تژی زامی کۆتایی بێ

چۆن سڵاوم ئەژمێری تەمەن؟

کەمن پژمینی سڵاوم رووەوتۆ

عافیەتی باڵندە کان....

من هەر کۆتایی خۆم ئەمرم

کە ماڵئاوایيت دەپژمێ

بژمێرە

تاگۆڕ

تا دووری....دوور

کـە خـەریکـی تـەواو

بوونم.

کەمن...بێ تۆ

من سەوزایی هیچ ئەوینێکم نەبیستو

داگیرسانی هیچ بزەیەک نەمخوێندەوە

ـ رەش دادەگیرسێ ئەوینی کازیوە ـ

کە نابیسرێ، داگیرسانی هیچ بزەیەک

کە ناخوێندرێ، سەوزایی هیچ ئەوینێکیش.

من لە داگیرسانی سەوزاییت ـ کەدەمبیستێ

لە خوێندنەوەی وێرانیم ـ کە ئەمچێژێ

رەش رەش بمخوێنەوە

گڕگڕ گوێم بۆ رادێرە

کەمن بێ تۆ رەش

کەمن بێ تۆ گڕ.

تاریک

وتەکانت تاریکترن لە ڕێ

لەشکست

لێلترم لە باڵێکی قەدەغە

لەبالندەیە کی تەماوی مانەم

مانەمی باڵندەیەکی لێڵ

قەدەغەم دەکا ـ تا شکست

لێڵیم ئەویند ارترە لە وشە

بە تاریکترین ڕێدا

به تۆدا.

به ئیعجازی ماچێک داندەگیرسێنم

وەک گەشترین باڵندەیەکی ساڵ

وەک ئەوین.

وتەکانت لە شکستی خوادا

ئەچۆڕێنەوە

لە مانای پیرۆزدا.

کە دەستت، کە مەرگ

وەک سێحری ئەهریمەن کە رەش و

وەک رازی بەهەشتی

کەسێو بوون

وەک سێحری سێوی سوور ـ دڵی من

کەدەستت وەک بەهەشت

کە دەستت یەزدانم بۆ دەکا بە هاوڕێ

ئەهریمەن کوا سیحری کە وەک راز

کە دەستت

کە خودا

وەک سیحری ئەهریمەن کە رەش و

وەک سێوی لەرزۆکی دڵی خۆم

کە رزین.

کە ئەڕزێ رەشایی ئەهریمەن وەک سیحری سێوی سوور

لـــە

بەهەشت

کـــە

رەشی دەپیۆی

تا دەستت ئارامیم نەداتێ

ماڵئاوا

کە مەرگ.

تەریب

چاوەڕوانی کازیوەی خوێندنەوەی ئەوینم

چاوەڕوانی تۆ.

تۆ کازیوەی چاوەڕوانی بێ ئەوەی هەتاوێک

بێ ئەوەی ڕوونێک

تۆ چەمۆڵەی زوڵاڵی ئەوینی

بە منەوە

به هیچەوە

کە شەو چاوەڕوانانە ژان ئەگرێ

دێمە دەر لە کەلی کازیوەی هیچەوە

وەک چەمۆڵەی هەتاوی

ئەوینێک

بە ئەهریمەنەوە

بە هەموانەوە.

چاوەڕوانی ئاوابوونی نووسینەوەی ژیانێک

چاوەڕوانی من.

من ئاوابوونی ژیانم، بێ ئەوەی کەلێک

بێ ئەوەی لێڵێک

من نەگبەتی ئەوین دەخوازێ

تـــا

هەموان

تـــا

هیچ

مـــن

و تۆ تەریب تا ـ رستەی یەکەم....

بەقەدەر

بمهێڵە ئەمجار ئاوارەییم لە گوڵی فەرشدا

کەساسیم لەرەنگی هەوادا

وەستایانە پەرژینی سرووودێک داشارن

بە قەرا سرووودێک بمهێڵە

رەنگی ئاوارەییم لە فەرشی کەساسیم دا

دانیشم.

جوامێرانە پەرژینی ئەمجارم بەرین کە

بە قەدەر بیرەنگی هیچێکی مەزنت

بنەخشێم

لـــە

فەرشی ژیانی گوڵێک دا

تا سروود دامشارێ....کەمەرگم....

تا پەرژین رەهام کا.....کە خۆمم.....

لەکیس چوون نامهێڵێ بۆسبەی.

سەربەخۆترین

سامانی بێ سنووری پاک

هەزاران خوێن...

هەزاران سەر....

تا دزینت بـۆ

سەرم.

سنووری سامانی سەرم! دەتپارێزم

وەک سەربەخۆ

نیشتمانێک

وەک ئاڵا.

ئاڵای نیشتمانم لە شەکانەوە دا

تا سەرکەوتنم

تا دزینت بۆ ئامێزم

من سەربەخۆترین دز

لە لەشتا

لە چاوتا

لـــــــــــــــە

قووڵاییت....تێدەپەڕم

ئەوسا هەموو تۆیەک لە خۆما

هەمووساتێک لەگەڵما

ئەی بێ سنووری پاک

ئەی دزراو....

تاڵ (٢)

چ تاڵە ئەوینی بێ هەستی تۆ ئەی گەشترین ڕێ

فڕینی باڵندەش بەردەوام پرسیارە

سەر سوڕمان لە کۆڵانی بێدەنگیدا

دەڵێ:

چ بێ هەستە

فڕینی تاڵی باڵندە

کاتێ وڵامی

پرسیاری بەندییەکان نادانەوە

تێدەپەڕێ

١٥/٨/٧٨ ـ تەورێز

بە رچەی گومانداا

گەڕایەوە بە رچەی گومانداا تا ئەمڕۆ

تا ئەمڕۆ گەڕانەوە لە تۆدا

کـــە ون لـــە

دەریادا

کـــە

زەمان لە نووردا...

کە دەریا ونە لە گەڕانەوەت دا

پاپۆڕەوان عەشقی کام دۆزینەوە

پەیی کام شەپۆل؟

کە زەمان گومانە لەمڕۆدا

دەرفەت مانای کام سات

لقی کام رۆژ؟

گەڕایەوە بەرچەی گوماندا تا ئەمڕۆ

کە ون کرا رووناکی رۆیین

گەڕایەوە

لـە رۆیـشتنی

هەموان کە درۆنگ کە ون

گەڕایەوە...کە زەمان...کە وزە....کە جوولّە

لە بێ ماناییدا بۆگەن

کە دونیا.

لە دونیایەک بە رچەی گوماندا ون

گەڕایەوە

بێ گەڕانەوەی دونیا.

ئوستووره

ئەرێ...

کە سەخڵەتێ لەو دیو گوڵەوە

بێ ئەوەی سنووری باخ.

چینە لە جەنگەڵ...کە چ زۆر؟

مەگەر کە شکۆفەی سەخڵەتی

ئەگینا

سنووری گوڵ

تا ئەوپەڕ

لـــە

جەنگەڵ...کەبەرین

لە پیاوی بەرینەوە بێئەوەی زۆر

کە خانمی سەخلەتی

تا سنووری ئەوپەڕ...

هەرشنەی گورگە

تـا پیـاوی بـەریـن بـێ

شکۆفە

تا بێ جەنگەڵ

لە تابووتەوە ـ لە ئاسـۆوە ـ تائەبەد

لە خەونەوە باران دەمرێ و لە مەرگەوە ـ باران

تابووتێک هەور دەگرمێ

لە هەورەوە  روانین دەڵێڵی و ـ چ لێڵە عیرفانی ئاسمان

تا ـ مان.

خەرمانێک ئەوین دەحیلێنێ زەمان

وەک سەرکەشترین مردوو

وەک خۆم

لە ئەوینەوە دەحیلێنم ـ تا تۆیەک لە نادیار

لە باران.

لە خۆمەوە دەست پێدەکا شەڕاب

کە مەستی منەتی خەفەتە بەسەر تەوێڵمەوە ـ تا

تووناتوونی بزە.

لە خەونی بارانەوە تا هەور

خەرامانم

وەک مەزنترین هەنگاو بەرەومن

وەک ئەوینترین حیلە ـ تا

نادیارێک لـە شـەڕاب ـ

تا

دڵ.

هەموو سەرەتاکان نوقمی شەڕابیترین چرکە (کەمن لێڵ)

گشت ئەوینەکان تەماویتر لە دوایین خەونی بزەی دایکم (کە تۆ بارین)

تێکڕای بیناکانی وەهم، هەر بەژنی خوا پێئەکەنن (کەئێمە وەزنی دواشێعر، کـە ئێمە ون)

عەشق بێ دەرفەتی تەسەلسولی باڵێک، تا رکە

بێ مەودای مەدارێک، تا رەها

بێ خەونی بارانێک، تا حیلە

تا شەڕاب

عەشق هەموو سەرەتاکانی نماوی شەڕاب

شەداری وەهم

لەعشقەوە دەست پێدەکا مەرگ

تا فامین.

من ئەوینی دەست پێکردووی فامێک

تا جەهالەتی نزمترین گەڵا

کە تەنیا

کە پاییز.

لـــه پـــاییزا حیلـــەی

تابووتی هەورێک، عەشق دەباری

بـــارین وەک وەزنی دوا

شێعر

وەک

ون.

لە شێعرەوە کۆتایی ئەکۆخێ: وشە

کە سەراپا ناتەواو

کاڵ

بـــێ

تۆ

تۆ -

کەمەزنترین حیلەی شێعری

بەرەو کارناواڵی وەهم -

عەشق، بێ زانستی خەفەتی گەڵا

بێ پاییز

ناپەرژێتە سەر ژیاننامەی

بچووکترین پیت

تامەزن.

عەشق بێ تۆ، بێ شێعر

تابووتێک هیچی ئەحیلێ

بارانێک جەهل.

بەیانی باران و تابووت و ـ دەسوتێم

سەرەتای ئەوین و خەرامان و ـ حیلاندی

نۆبەرەی قووڵایی گەزیزە و ـ سەرەتا

بەیانی ئەوینم و ـ لەکیس چوون

چ

سەیرە، بوونە ـ بوون ـ تادیار

کـــە

بەیان بوو بەمن

بوو بە تۆ

تۆ، نهێنیترین «فاعیلی» ئەم شێعرە

بێ ئەوەی ناوێک لە هەستی

لەشت

لە پڕشنگ

تۆ، کازیوە و بەیان پێکەوە و من

دەسووتێم

تابووتێک لە ئەوین ـ هۆنراوە وەک باران

مەرگ ـ وەهمی سەوزی کۆترو وشە

تاشێعر ـ سەوزایی و کەروێشکەی وەهمم

تاتۆ ـ هۆنرانەوەم.

تاچاڵێک بە باڵای ئاسۆم

ئاسۆی رووح

تا ئاسۆم لێڵی تۆ

لێڵی خەم.

تابووتێک کە ئاسۆم ئەکۆخێ

منێک کە نهێنی شێعرو لەکیس چوون

سەرەتای باران و ئاسۆی خۆم.

لە خۆما ئاوا بوون

لە خۆما شەڵاڵــی نهــێنی و دوا

سەفەر.

چاوم ـ شەتڵ کردن و پێوران لە یارا ] رێبوارێک تا تەنیاترین رەگیئەوین[

لەشم ـ پرژاندن لە تابووت و ئاسۆدا ] کە لە تۆدا ئاوا بوون

کە لە تۆدا هەڵـانن[

لە تابووتەوە دەژیم ـ لە ئاسۆوە ـ تا ئەبەد.

گورگێک وەک من...

گەورەی بچووک

سەرکەوتنت نەخشی گوڵی سادە ماسی

پڕ لە ئاو

تژی لە تاسە...

ماسی سادەی بچووکی دەستت

ئاوی سەرکەوتن

تاسەی گوڵی پڕ لەنەخش...

گەورەی بچووک

فەرشی غەریبیم لێرەوە تا... نازانم

تا...خۆتی ئێستا

تاسەی ئێستام...خۆتی لەهەمیشە

خۆتی لە ویڵی

گورگێک ئاوا...لوورەی غەریبیم

ئاوا...خۆتی پڕلە نەخشم

ئاوا...ئەکەنێ:

]غەریبی گورگێکی وەک من...تا

لوورەی پڕ لە رەنگی غەریبیێک...تا

کەنینی هیچ بەدەم وێڵێکی...ئاوەو ـ (من)

گورگێک وەک من

بە رەنگی لوورەوە، سەر خۆش

بە وێڵی هیچەوە، غەریب

گورگێک وەک من

تا گەورەترین بچووکی ئەم دونیایە ـ دڕندەیی

تا بەرینترین پێدەشتی زستان ـ برسێتی

تا قاقڕترین نهێنی رووان ـ عەشقێنی

## گورگێک وەک من، عاشق

ـ هووووووووووووو....]

گەورەی بچووک

سەرکەوتنت ئەویندارى وشەم ـ بۆ باران

دەستی بچووکی غەریبیت ـ لێژنەی رێژنەی ئێوارانم

رێژنەت بۆ باوەشم

هەڵچوونت بۆ شێعرم و...

لە ئاست ئەو تابلۆیەدا

] ئیزنی ماچ و ئیزنی مەرگ

و ئیزنی بارینم لەلەشتا[

دەپشکوێ...

بمبوورە ئەی تابلۆی ئاستم

یاسای گەورەبیت چەند سەوزە ـ سەوزتر لە مێیینە

[... ڕێژنەت بۆ باوەشم

[... (من و چەترێکی پڕ لە نەخشی سادە ماسی

من و پیاسەی کاکەشانی ڕەنگی هەڵمژین

من و لەشت و کتێبی پیرۆزو

ڕێیەکی بێکۆتا)

بارانی بارانی بارانی بارانی خۆم!

کتێبی پیرۆزی لەشت لەڕێیەکی بێکۆتادا

ڕەنگی کاکەشانی چاوت لە کتێبێکی پیرۆزدا

ئەدۆزمەوە

ئەخۆمەوە

ئەمرمەوە

ئەژیمەوە...

تۆیەک لە ڕەنگی مێینەترین سانم

ـ سڵاو

منێک نهێنی ترم له هەتاو

ـ ماڵئاوا

من وەک هەتاو سڵاوێکی مێیینەم

من وەک هەتاو سڵاوێکی مێینەم ـ

ئەدرەوشێمەوە

گەورەی بچووک

چ سەرکەوتنێکی مێیانەیە ئێستات...

... تو سەوزترین مێیینە

... من میوانگرترین بەهار

دڵاوا‌ترین دەشت...[

...گورگێکی وەک من بەهاری

!!هووووووووووووو

باخەوان عاشقانە نامە دەنووسێ

بریا... ئەو نامەیەی لەرێکەوتی مەرگا بە مەبەستی مەمکت

مەمکت بە مەبەستی مەرگە  لە دڵما

لە رێکەوتی هەموو پەپوولەکانی ئەم نووسراوەدا.

کەی رستەی نووسراوی لەیلی لە کووچە خەوی پەپوولەکانا

بریا ڕێبواری ونی کۆڵانەکانی خەون.

تا گەیشتن بە ڕێکەوتی مەمک و

نهێنی هەستی.

لە دووهەمین سەرەتای بزووتنەوەی مەمکڕا

نامەیەک ون، مەبەست ون، ون من...

بریا مەبەستی هەموو نامەکان بێ ئۆقرەییم.

ئەو مەرگەی لە دەرفەتی هیچی زامەوە لە وشەدا

لێوڕێژی دوێنێ و

بەسردوێنێ و

بێ ئۆقرەم دەکا.

ون من ـ لە هیچ دەرفەتێکەوە زامداری هەموونامەکان و بێمەبەست

لێوڕێژی دوێنێم و مەمک و (دوێنێکانی تریش)

بێ ئۆقرەم....ـ با ـ بێشەرمانە دەشتەکانی ئاوارەیی...

کەمن شنینەوەی خۆم بم.

ـ با ـ هاوڕێی شەکەتمە لە سەفەردا

سەفەر دەکەم بەشەکەتی ئەو بایەدا، هەموو نامەکان و مەمک و سبەینێ

تێکڕای دوێنێ و...

ون ئـۆقرەی زامـداری پـەپوولـە

کۆڵـان شڵەژاوەکان ودڵ...

ئەو مەرگەی لە دەرفەتی هیچی عیشقەوە، لە ژووانم دا

(چ نـــازێکی مێیانـــەی

تۆ، ئەی ئەهریمەن)

ئەو مەرگەی مەمکی سبەینێم لە دەستی دا

(چ ئارامـــــــــــــشێک

دەبەخشی هەستی)

ئەو مەرگەی بە دەشتەکانی هەستی من و مەمک دا، ئەشنێتەوە

(چ عاشقانە گۆڕەکانم

بۆ ئەڕەخسێ)

بریا لە تابووتی عاشقی سەوزی سبەی

کەدەپشکوێ من

وشەکان عاشقانە بە دەشتەکانی شنینەوەدا

ئەو نامەیە ئۆقرەم دەکاتە سەوزی سبەی تابووت

کەدەمرێ من

لە حەسرەت ئەو بایە دەست

بەتاڵەی

نامەکانی من لە رێکەوتی

پەپوولەدا...ون.

نامەکانی من چ ساکار لە تەفسیری چاوی دەریادا

کە جەنگەڵ زەرد

که جەنگەڵ بێئۆقرەی سبەی خۆ بەخشینی بارانەیە.

دەریا چاوی ساکاری نامەکانی سبەینێ زەرد ئەبەخشێ

بەزەمانی تابووتاوی ئەو وشانەی

بریا بەمەبەستی بێ ئۆقرەییم...

دەنووسرام لە نامەیەکی جەنگەڵی زەرد و ئۆقرەی کەسکا:

زەرد: سبەینێی نامەکانی ساکاری و

کەسک: وشەی ئەو تابووتەی بەزەمانی من...

نا...نا...لەهیچ دەرفەتێکەوە ئیزنی سەوزییم ئەهریمەن

لەهیچ دارێکەوە کە سێو دەگرێ بەرز،

لێگەڕێ باخ عاشقانە پێئەگا گۆرانی سێو

بەرز: ئەهریمەن لەهیچ سێوێکەوە

تا...باخەوان.

لێگەڕێ نامەیەکی ون وەک ئەهریمەن

بە گۆرانی سێو و

باخی عاشق و

ئیزنی گەیشتن.

بەری گرتووە، بڕوانە لەیلی...ئەو باخە بێ شەپۆل و هەورە

ئەو دەریا بێ کووچە باخ و نامە و گرمەیە

ئەو ئاسمانە بێ شەپۆل و سێو و منە...

تەنیا لە هیچ دوێنێیەکەوە

نامەکان بەمەبەستی سیفری مەبەستی ئەوین

لەون

بوون دا.

لێگەڕێ...ئەهریمەن بە سۆزترین عاشقانەی...

تا دەشنێتەوە سبەینێ بە پەپوولەکانەوە لەزەماندا.

تائیزنی گەیشتنی عاشق و سێووگۆرانی.

تا باخەوان بەپیرانەترین هێلّدا...سەوز.

وەک هیچ دارێک کە سێوی مزری باخەکانی هەستی و

غەمینترین نۆبەرەی جەنگەڵ.

بریا... ئەو سبەینێیەی بە مەبەستی لێڵ

باخەوان عاشقانە نامە دەنووسێ

ئێمەی عاشق بۆ دەبێ هیچ ڕێیەک بە هەنگاومان

شەپۆلی بە دوێنێمان و

تۆیەک بە دڵمان...

هەڕاجی هەرچی لەگەڵ ـ با ـ....ون

لەگەڵ وشە نووسراوە

هەڕاجی هەرچی مزر

وەک بێ ماڵئاوایی دەریا بە مەبەستی دوور

هەڕاجی من، کە مزر دەمرم

تا گەیشتنی نامەیەک بەمەبەستی تۆ

هاوینی ۸۰ ـ بۆکان

لەشەش بەشدا؛ ئەگەر

خودایانە، بە سەر تەواوی مەملەکەتی سەربەخۆی لەشتا

غەریبانە، وێڕای گردەلوولێک لە چاوی کێدا

زاڵمانە، لە ئاوەدانی داگیر کراوی مەمکا...

بــــەوشـــــنەی زامــــی

پەپوولەیەوە بۆ وێل؟

ئاوەدانی غەریبی خوا زاڵمانە لە چاوتدا و

منی غەریب ئاخۆ رووبارێ بۆ وێڵیم و...هیچ.

چۆمێ لە وڵاتی پەپوولەدا غەریب و

لەشت تەواوی مەملەکەتم...

منی رووبار هەروا سەرشێتی پەپوولە و وێڵی...

خودایانە، لە شەش بەشدا داگیرت دەکەم:

**یەک:** بریا هیچ وێڵێ وەک من شاعیر با

ئەوسا

من تێکڕای وشەکانت و دڵ

کە تۆ مانایەک بۆ هەمووم.

**دوو:** خۆزگە رووبار سەرشێتی منی غەریب

ئەگینا بۆ

دەخوشـــێم بـــە شـــنەی

پەپوولەوە لەزامدا

بە دەماری هیچەوە

لـــــە

تەواوی مەملەکەتی خوایاندا...

**سێ:** ئەگەر غەریب لە چاوت دا زاڵمانە وێڵ

ئاخۆ

هەنگاوە لێڵەکانم لە چاوتدا ون

تا

کەی دەدۆزمەوە شوێنێ بۆ ئاوەدانی...

چوار: ئەریَ: کە ئاوەدانی دووپاتەی مەمکت

ئەی دەنا

چۆن من ئەبەدییەتێک لە تۆو

بەردەوامیت.

پێنج: دەزانم: شنەی لەشت سەرشێتی غەریبی خوداکان

کەوایە

مـــن کـــەی فامیومـــە

مانایەک بۆ دووریت

زەمانـــیَ بـــۆ

لەشت

کــــــەتـــــۆ

سەربەخۆتر مەملەکەتیَ

بۆ دوێنێ...

شەش: دەنا، دونیا سەربەخۆیی خۆی و شنەی پەپوولە

بۆیــە حــەولم بــۆ داگیرکــردنی

مەمکت

کـــەشـــــنەی

داگیرسانم.

لەشەش بەشدا:

ئەگەر مەرگم شێعرێکی لاڵ بێ بۆ زەمان

تۆ دەژیم

تا

هـــەمـــــوو

خوداکان غەریبانە دەچنە گۆڕەوە.

پاییزی ٨٠ ـ بۆکان

درێژەی هەیە ئەو شێعرە

چ ریتمێکی عاشقانەی هەیە مەرگی باخ

چ شێعرێکی (دەبارێ خەفەتی باخەوانی پاییز)

کێ منەتباری تابووتە کە دارستان کتێبێکە لە وەرز

چ شێعرێکی مەرگاوی هەیە عەشق

باخێکی چەند عاشقانەیە خەفەت لە باران

لە راستیدا... عاشق، مەرگی تابووتی بە منەتی عەشقەوە

باخ، شێعری خەفەتی بە وەرزێکی کاغەزییەوە

دارستان، رادەژێ بە چ ریتمێکی

کە تەنیا

گۆڕ....

گۆڕ...

گۆڕ....

چ روانگەیەکی مێرانەی هەیە گۆڕ

که عاشقانە دەلوێ بۆ دوێنێ و ئەمڕۆو

گۆڕیچەی سبەی لە چ ریتمێکی سادەدا.

دەلوێم....دەلوێم...

تا نەبانی و نامۆیی شار....تک...تک

لەوەرزی کاغەزی کتێبدا

لەرستەی تابووتە عاشقەکاندا

دووپاتە...

چ شێعرێکی شەڵاڵی خۆمم هەیە...

کە مەرگ پێدەشتی هەموو زەمانەکانم

رستەی تێکڕای بایەکی بەشەپۆل یاخی

شەکەتە لەم سەفەرە لێڵەدا...تا

ڕوونترین تـابووت کـە

عاشقانە بۆم دەلوێ....

کەی لە تابووتەوە بەشی دووهەمی ئەم شێعرە...

لە باخەوە ـ کەمەرگ شەپۆلێکە لە زەمان ـ

دەگەمە....عاشقانەترین نهێنی ریتمی داگیرسان...

عاشقانە... عاشقانە... عاشقانە...

داگیرساوە تابووتێ لە شێعری بۆ تۆ

کوا ـ با ـ یەک زوڵاڵترین دوێنێو

قووڵترین پەنجەرە

لێـــڵترین خـــەفـــەتی

باخێكی پاییزیم...هەتاكوو

كوا...باران.

لەمەرگەوە عاشقانەترین شەقام بۆ لەیلی

دەهۆنمەوە رستەی تابووتێكی غەریب

كە رادەژێ بە لووتكەی ئەم رستانەوە...

كە رادەژێ بە ئێستەوە...

كە لە ئێستاوە تا لووتكەی دوورترین نهێنی نامەكانم دەلوێ

بۆدووری...

نا...نا...نا...مەرگ كە عاشقانەترین نامەی...

دەخوێنمەوە رابردووی دیوار

هەڵچوو

لەمابەین تابووتی عاشق ـ کەمن

دەینووسم ـ

هەتا بـاخی پاییزیـت ـ کـە تـۆ

دەیخوێنییەوە ـ

میوە بە میوە.

کەی لە خەفەتەوە بەشی سێهەمی ئەو شێعرە

لە دیوارەوە ـ کە روونترین دوێنێمانە ـ

دەگەمە رستەی عاشقانەترین دابڕان...

نا...نا...نا...درێژەی هەیە رازانم (کە دەلوێ لە زەماندا)

دریژەی هەیە تابووتم (کە باخ منەتباری

گۆڕیچەیەکە)

دریژەی هەیە بەشی سێهەمی ئەم شێعرە

تا تابووت عاشقانە بۆ گۆڕم دەلوێ.

چ ریتمێکی شێتانەی هەیە زەمان

من رادەکەم

رادەکەم

تا

دیوار روونترین دوێنێم بێ.

هاوینی ٨٠ / بۆکان

شینترین بەتاڵی تەنیایی

ماڵئاوا...

شاعیرترین سەفەر بەرەو گومان

بە تاڵترین چرکە لەمن

رووحی بچووکی دونیا.

کە تۆ دونیای بچووکی سەفەری بە تاڵ لە من

تا من چرکەی گومانی شێعر

تا کوا بەردەوامی هیچم

که دووریم شین‌ترین دوێنێی پاساری

هیچ شێعرێ ماڵئاوا له سه‌فه‌ری شینی دووریم

هیچ شینێ تاریکیم به بڕوای ئه‌مڕۆوه‌و

گومانی مانه، خه‌فه‌تبار شاعیری به تاڵ له پاساری.

ماڵئاوا...

شین‌ترین دوێنێی پیاڵه‌یه‌ک ئاو

له تینوێتی درێژی شێعره‌وه

له زامی فڕینی بڕوایه‌که‌وه

تا شاعیر ئاسمانی ئایه‌تی گومان

تا شاعیر له‌م شێعره‌دا هه‌تەر ده‌کا...

تا هەتەر دەکەم ئاو درێژ دەکانەوە ئایەی تینوێتی و

دوێنێی تەنیایی فڕین لە چاومدا

کە خەفەتبار شێعر بۆ دووری

کە بەتاڵتر مەودا بۆ پاساری...

ماڵئاوا.....

شینترین بەتاڵی تەنیاییم.

پاییزی ٨٠ـ بۆکان

ئەگەر خەرامان و زۆرشتی تریش

]بۆ رەهبەر مەحموودزادە کە ئارامی دەریای داگیر کردووە[

پیاوی سەڵتی عاشق، لەشەوێکی سەفەری هەموو رستە پەڕەوازەسەوزەکاندا ـ ون

لە قاقا تەنیایی تاریکدا، جگەرە

سەوزی سەفەری شەوی عاشقێک

لەرستەیەکی سەڵتی پەڕەوازەدا

قاقا...لێل.

ون ـ شەوی پیاوێکی پەڕەوازەی سەوز

لە تاریکی جگەرەیەکی سەفەری.

ون ـ سەفەری جگەرەی تەنیایی،

تا

قاقا....تاریک لە سەفەر

تا....عاشق تێکەڵ خەونی وێڵ.

پیاوی سەڵتی شەو ـ کە ونە لە وێڵی دووکەڵێکی بێ رستە و عەشقدا

کە لێوڕێژە لە جەماوەر

لـە خواردنـەوەی هـەمـوو شـەوەکـانی

رابردووی چراداو

هـەمـوو سـاتەکـانی گـەشـی رسـتە

عەشقێنیەکانیپەڕەوازەیەک.

جەماوەرێک: لێوڕێژ لە پیاوی تەنیایی

چرای رابردووی کامەوێڵ

شەوی غەریبی کامەگەش

سەفەری دووری کام دووکەڵ:

کـه پیـاوی سـەڵـتی عاشـق لـە

شەوێکی سەفەری

هــــەمــــوو

سەوزیی قاقا...جگەرە

قاقا...ون.

ون ـ سەرەتای بزەی باڵندە بێ سامانەکان لە هەرێمی هیچدا

هیچ هەوارێ سامانی باڵندەی بزە

هەتا سەرەتای ونبوونی عاشقێکی پەرەوازە:

کە لە شەوێکی سەفەری لێورێژی سەڵتی و ماڵئاوا

لێورێژی عەشق و ماڵئاوا

تا

تــەنیــاترین تــەفــسیر بــۆ دووری

خەراماان.

پیاوی سەڵت و عاشق:

ئەگەر شەوێک خەراماان بمرێ

**(تا سێو رەش، ئەوین لە زەماندا)**

ئەگەر شەوێک خەراماان بژی

**(تا باڵندە گەش زەمان لەئەویندا)**

قاقا... جگەرە و ون و تەنیایی

بە سەفەری هەمیشەی ئەو باخانەدا...رەنگە رۆژێک

بە مانای ئەو رستانەدا ئەگەر گەش...

کە باڵندە سەڵتەکان پەڕەوازەی هەواری دووکەڵ و

ئەو

لێورێژی تەفسیری تەنیاترین خەرامان.

پاییزی ٨٠ـ بۆکان

دریژترین شێعری عاشقانە

لە کوێوە سەرەتای پێکەنینی بومەلێڵ

لە کوێوە دریژترین شێعری عاشقانە

کەمن تاریکترین شاعیر.

ئاوێتەی حەیرانی داگیرساوی ئەستێرەیەک...خەونم

تا

لــەنگــەرێــک

لەسەر شڵەژانی پەپوولە.

عاشقانەترین شێعری درێژ لە بوومەلێڵ

حەیرانی خەونی پەپوولەیەکە....لێڵ

وێڕای من و فانووسەکانی ئەم شارە

هەموو قاقاکانی.....تاریکی.

وەبیرت دێ...وەبیرت دێ لە قەسری ئامێزمدا ماسی

تا خوشین بەزەمانەوە

لە دوێنێترین رووبار دا

وەبیرت دێ....سبەی؟

نا... تۆ ئەگەر سبەینێت رووبار

بڕوات دەکرد بە تواناى من و شێعری عاشقترین لێڵ.

کەس وەبیری نایە سەفەر لەشەوێکدا

خوداى عاشق و

من و شەقام...

درێژترین شەوم ئیمزادەکەم بۆ رابردوو

بۆو فانووسانەی بەیادی بیرهێنانەوەی مێژووی هەنارێک

بەیادی کازیوەی رەهەندێکی زەمانی لیخن

بەیادی منەوە کەخوێنی زەرد...

تۆ وەبیرت نایە سبەینێ و منێک لەودا

وەبیرت نایە رووبار

ئاخۆ من بەشێک لە مێژووی نەنوسراو

تۆزقاڵێ لە سبەی بیرەوەرییەکانی وەرز

هیچێ لە زەمانێکی یەستا نەهاتوو....؟

نا.... تاریکی، قاقای هەموو فانووسەکانی ئەم شارەو

عەشقیش سەفەری لەشەودا

بەرەو درێژترین مێژووی فانووس.

هەتا ئیمزای سبەی بە قاقایەکی فەرامۆش

بۆ و شـاعیرەی رەنگـە رۆژێـک درێژتـرین

شێعری زەمان...

بە ناوی هەموو شەوانی عاشق و فانووسەکانی

قا... قا... زەردایی.

هەموو شەوانی فەرامۆش کراو لە عەشقدا و

فانووسەکانی رووبار...

تەنیایی من بە عەشقی ئەو قاقایانەی فانووسێکی فەرامۆش

بە زامی ئەو شەوەی مێژووی رەشی ناوی من و

بە یادی هەموو زەردابیە عاشقەکان

**ـ ئەگەر نەمرێ تەنیاییم بۆ بەیان ـ**

من ناوی رەشی مێژووی ئەو شەوەم

لە فەرامۆشی فانووسێکدا قا.. قا.. بە عەشقی تەنیایی تاریکی

ئیمزا کرد.

بە یادی هەموو زەردابیەکانی رازاوەی بێ تاقەتی..

تەواوی شەوم بست بە بست خۆشویست و

رووبار

تادوێنێ.

من هەموو تەنیاییم هێشۆ هێشۆ و

کێ ڕەزی ئەم تەمەنە دووکەڵاوییەی عاشقانە پاراو کرد

ـ هێشۆ بە هێشۆ تەنیاییم

شەڕاب ـ

کێ مەستی تاریکیم و تەواوی دوێنێم؟

من بە یادی هەموو زەردابیەکانی شەهید

تەنیایی تاریکی شەوم هەتا دوێنێ و

عاشقی دوو کەڵی تەمەنی ئەم ڕەزە...

من لە گەڵ هەموو تەنیایی

شەڕابی هێشۆی تاریکی و

دوێنێی تەواوی باخچەکان

سەوزانە مەست ئەڕوێم.

پاییزی ٨٠ ـ بوکان